# دیاری مه‌هاباد

## ( په‌ندی پیشینیان )

له‌ هه‌ لبه‌ سته‌ پرمه‌ به‌ سته‌ کانی :

مه‌لاغه‌فوری حافزی مه‌هابادی

له‌ ژیر چاوه‌ دیری :

ماموستا هه‌ ژاردا

# مەهابادی دیار

## لەهەلبەستە

پڕمەبەستەکانی مەلاغەفوری حافزی

لەژێرچاوەدێری:

## مامۆستاهەژاردا

کۆکراوەی: ر. رەش ئەحمەدی

# کۆمەڵێک لە شیعرەکانی

ماموستا مەلا غەفوری وەهابا دلم بە رجا کەوت کە هێنیا
بوی من لە بارەی چۆنیەتی تەرزو دانا دو دە بیروبڕوای
خۆم دەربڕم
رەنگە ئەگەر بێی لەگەڵ بڵێم خوێنەوەران لایان وابێ
روبینیم بە خەرجم داوە ئەگەر وا بیربکەنەوە لێم رونە
زۆر بێ ئینسافن مەلاغەفور لەگوێنەرێکی بە لەعونەرو
دەست رەنگینە ئەگەر ماڵی دنیای نەبوە ئێشیم وا بید
قەت بێ بێ
بەڵام هەقە لە شاعیرەو دەم پاراوی هونەر دڵ مەزنەکا
رەنگینە. لە تەرازوی لەگەڵ سەنگانی وێژەوانی تابێژە
قورس و سەنگینە
هەوجێ نیە دانەدانەی شیعرەکانیشی کەمەوەو خوێنەرانی
شارەزا کەم. لەبەر ئەوەی بە وردی وزاناییەوە بیانخوێنی
وباشیان سەرەوەدەر، لێی دەرکا دەزانێ من بە دڵ دەڵێم
وراست دەکەم کە مەلاغەفور ئێستا کەسێتیکە لە عالمانی
کوردەواری و لەلای من تیشک داوێژی و هێندێک لایان

وا به‌ کورتی. له‌ خوا ده‌وێ ئه‌م شاعیره‌ بێچاره‌مان هیچ
نه‌بێ هه‌نیه‌وه‌ی ره‌ست که‌وێ، شیعره‌کانی خۆی پێ چاپ
بکات، که‌ له‌و به‌هره‌یه‌ بێ به‌ش نه‌بین.

هه‌ژار

کرج ١١/٨/٦٢

شناسنامه‌ی کتاب

نام کتاب: دیاری مهاباد

نام نویسنده. ملا غفور

نام انتشارات: سیدیان

چاپ از: چاپخانه

تاریخ انتشار: فروردین ۶۴

نوبت چاپ کتاب. اول

تیراژ: ۲۰۰۰ جلد

## پێشەکی

کۆمەڵێك لە شێعرەکانی مامۆستا مەلا غەفوری مەهابادیم بەر چاو کەوت کە هێنابوی من لە بارەی چۆنیەتی تەرزو ماناوە بیرو بروای خۆم دەربرم ٠

رەنگە ئەگەر پێشی هەڵ بڵێم خوێندەواران لایان وابێ رو بینیم بە خەرج داوە ، ئەگەر وا بیر بکەنەوە لێم رونە زۆر بێ ئینسافن ٠

مەلا غەفور هۆنەریکی بە هونەرو دەست رەنگینە ئەگەر ماڵی دونیای نەبوە پێشم وا نیە قەت بێبێ ماڵم هەقە لە شاعیری و دەم پاراوی چەندی دڵ حەزکا رەنگینە لە تەرازوی هەڵ سەنگانی وێژەوانی تا بێژی قورس و سەنگینە حەوجە نیە دانە دانەی شێعرەکانی شی کەمەوە و خوێنەرانی شارەزاکەم هەر کەسێ بە وردی و زانایی .وەیان خوێنێ وباشیان سەرە ودەر لێ دەرکا دەزانی من بە دڵ دەڵێم وراست دەکەم کە مەلا غەفور ئێستا کە ئەستێرێکە لە ئاسمانی کوردەواری و لە لای من تێشك داوێژی و هێندێك لایان وایە کوێرە لە خوام دەوێ ئەم شاعیرە بێچارەمان هیچ نەبێ هێندەی دەست کەوێ ٠ شیعرەکانی خۆی بۆ چاپ کات کە لە بەهرەی بێ بەش نەبین

هەژار

١١/ ٨/ ٦٢ کرج

به نێوی خوای مەزن کە یارمەتی دام

ئەو بەرهەمە جوانە کۆبکەمەوە

کەندو کڵۆی رێگای ژیان ئەوەندە زۆرە کە ئینسان هەر چەند لە مەزرای چۆڵ و چەتون و سامناك و بێ دەرەتانی چەرمەسەری رەهەندە بو بێ هێشتا هەست بەوەی دەکا چوار چێوەیەکی پۆلایین رەگ و لەش و ئەندامیان لە نێو خۆ گرتووە و ئەشکەنجە و ئازاری ئەدەن ·

ژیان ئەو قۆنلغە بێ بەقایە لە نێوان دوو نەبونی نادیارا مەیدانێکی پان و بەرینە بۆ هەڵ سەنگاندن و تاقی کردنەوەی ئینسان تا بەڵکو بتوانێ بەر هەڵستی نەزانی و دڵرەقی راست بێ تەوە و پڕ بە دەمی بۆ رزگاری ئینسان لە دەست ئینسان هاوار بکا و قەڵای زۆرداران تێك بروخێنی و دونیای برایەتی و خۆشەویستی بەدی بێنێ

چ خۆشە ئەوکاتەی ئینسان بۆ وەی بژی و خوێن لە رەگ و ئەندامی لەشی دا بە زەبری خوشەویستی بەرەی ئادەمیزاد پێ بداو ئاسەواری گورگە بە رواڵەت بەستەزمانەکان نەمێنێ و ئینسانە ئازادەکان بتوانن لە سروشت و دەست کەردی خوداوەندی بۆ پێشکەوتن و خزمەت بە یەکتر کەڵك وەرگرن

یەکەم جار نی‌یە مەلا غەفوری ( حافز ) ئەناسم و ناشمەوێ بەو بسانە ئەدیبێك بە عەزیزانی ئەدەب پەروەر بناسێنم چونکی

ئەوەی راستی‌یە قەڵەمێك کە لە پێناوی برس و ترسا لـــە رێ

هەتڵە نەبوبێ رێی هەڵەرۆیی ناگرێتە بەرو زۆر بە ئاســانـــی

جێ ی خۆی ئەکاتەوە و هەوڵ ئەدا لە دەردەکان بدوێ ئەو

دەردانەی ساڵە های ساڵ لە گەڵمان بوون و خاوەن بیـــرو

بروایەکان ناسیویانن و بۆ لە ناو بردنی ئەوێش و زامانـــەی

ژیانە تێکۆشاون و تەنانەت ئەگەر تێ گیراوی یەکیان لە ژیـانـی

دا بەدی هاتووە هەوڵیان داوە بە شێوەی پەند و مەتـــەڵ

بۆ بەرەی دوای خۆیان بیهێڵنەوە تا ئەو گرێ پوچکـە یـــا

هەڵەیە رۆژگارێکی سەر لە نوێ دویاتە نەبێتەوە و دەرســـــی

لێ وەرگرن بەڵام کوا ئەورۆ وایە ؟

خەم و دەردی ژیان ئەوکات بە راستی و دروستـــــی

دێتە سەر کاغەز و قەڵەم ئەتوانێ لاپەرەکان بە درکاندنی ئەو

دەردانە بنەخشێنـێ کە نوسەر یا شاعیر وەك هەمو خەڵکـی

لایەنگر لە ناو دەردا ژیا بێ و خۆی لە خەڵك و دەردەکانیان

بێگانە نـەزانی

جا کێ لە مەلا غەفور زۆرتر خەمی ژیانی بە ئەستـــۆوە

بووە و دونیای روناکی ئینسانەکانی وا بە تاریکی دیوە ؟

کوتنی دەردەکانیش ئەوکات ئەتوانێ باش و بەجـێ بـــێ

کە خوێنەر لە بیستن و شارەزابون بە سەریاندا کاڵـــەی

چارەسەری هەڵبەستێ و هەستێ و دەرمانێك بۆ ئەو هەمـــو

کەم و کوریانەی ڕێگای ئینسانی دڵ بە دەست زیانەوە بدۆزێتەوە بۆ من کە هەمو کات ئاواتم ئەوە بووە بەزەی خۆشی بخەمە سەر لێوە بە بارو گۆنا ماتەم گرتۆکانی ئینسانی لێ قەوماوو هەناسە سارد جۆی شانازییە توانیم بە هاتو و چۆ و تەقالای بێ وچان بە سەر زۆر گیرو گرفتان دا زاڵ بوم و بەرهەمەکانی مەلا غەفور کە لە درێژەی تەمەنی دا سەوزایی بەهار و گەشە و تروسکەی ئەستێرەکانی بە چاوی دڵ دیوە کوکەمەوە و بەو چەشنە بەرگری لە لە ناو چون و فەرامۆش بونی ئەو هەستە خاوێنە بکەم

بە پێویستی دەزانم سپاس بکەم لە مامۆستای هەژاران هەژاری پایە بەرز لەوەی چەن شەوو و ڕوژ لە حالێك دا نەخوش بو لە ماڵە هەژارانەکەی ماوەمان گرت و شێعرەکانی مەلا غەفوری بە تەرازوی شێعرناسان لە باری تەرز و ماناوە هەڵسەنگاند و بروای خۆی لەو بێیە دا دەربری.

جا ئێستا بە یەکەوە گوێ بۆ بەسەرهات و ناسینی ئەم شاعیرە دڵ بە خەمە ڕادەگرین .

بەو ئاواتەی کە ئاواتی هەمو ئینسانە باشەکان بێتە دی و بتوانین ئەو تۆ و کە شیاوی پلە و پایەی ئەو شاعیرەیە ڕێزی لێ بگرین و نەهێڵین لەوەی زیاتر بە دەست تەنگی و هەژاری زیان بەرێتە سەر

ڕسولی ڕەش ئەحمەدی

١٥/ ٨/ ٦٢ مهاباد

## کــورتــەی ژیــانــی شــاعیــر

پ: ماموستای بـەڕێز ماومیەکــی زۆرە خەریکی کۆ کردنەوەی شێعرەکانیــن وا باشە بۆ شارەزایی خوێنەرانــــی بەڕێز ئەوەی لە بارەی خوتدا وەبیرت دێ بە کورتی بۆ مانی بڵـێی:

و: وەڵــڵاهی رەسوڵ گیان ئەوەندی لە بیرم بێ ژیانــم هەر چارەرەشی و بەد بەختی بووە بنوسە خەم چاو لــە دەستی هەژاری کەنەفتی چارەرەشی ماڵ بە کۆڵی بەڵام بە پێچەوانەی هەمو ئەوانە هیواداری بۆ دوا ڕۆژێکی رونـــاك

نێوم غەفور کوڕی دەروێش عەبدوڵــڵا لە ساڵـــی ١٣٢٦ کوچێ بەرامبەر بە ١٣٠٦ای هەتاوی لە شاری سەقز لە دایك بووم دوای ساڵ و نیویك باوکم ماڵی چووە بۆ بانــە و لەوێ خەریکی کەسپی دەباغچێتی بووە٠ تا لەو کاتــەدا بۆ چەرم کرین هاتووە بۆ مەهاباد سەفەری ئەو دەمــی بــە کاروان و زۆریان پێچووە ڕێگا و بانیش وەك ئێستا نەبــووە٠ لەو ماوەیەدا کە بابم دە سەفەر دا بووە ئازاری خروێکــە واتە ئاوڵە لە بانە پەیدا بووە منیش لە بەر ئەوەی کــەس نەبووە بم کوتێ توشی ئەو ئازارە بووم هەر چونی بــووە ئەو هەواڵەیان بە باوکم داوە ئەو زەمان حەکیمێکی عروسان

له مههابادی بووه گووایه دهرمانێکی بووه که یاند بایه
ههر چاوێك له کوێر بون رزگار دهبو مسقالی ئهو دهرمانه
به لیرهیهك و لیرهش ئهو کات ٢٨ قران بووه٠

باوکیشم به پهله مسقاڵێك لهو دهرمانه دهکرێ و به
کارواندا دهی نێرێتهوه بهڵام ئهو پیاوهی دهرمانهکهی
منی پێ بوو له سهفهری گیر و گرفتێکی بو دێته پیش و
نۆ ڕۆژان لهوی ماتڵ دهبێ داخی داخانم وهختایهکی
دهگاته که لیخان که من بینایی‌یم له دهس داوه ئهو
چاوانهی هیوای دووا ڕۆژی من بوون و به هۆی ئهو
چاوانهوه دهمتوانی ژیانێکی باشم بایه٠

ژیانێك دوور له کهنهفتی و لارهملی و چاو له
دهستی وهکو ئهو خهڵکه ئهمنیش به کاسبی و رهنجی شان
دهمتوانی بژیم و منهت له کهس ههڵنهگرم٠ بهڵام بهداخهوه
به پێچهوانهی ویستی من له گهڵ ژیانێکی پڕ ئاخ و داخ
و تهنگ و چهڵهمه و خۆزگه و بریا و دهس تهنگی و
لارهملی و مهمنونی ئهم و ئهو و زۆر شتی تر ڕو به ڕو
بوم کاتێ ئهو دهرمانه گهیشتهوه بانه زۆر کهس له هاو
تهمهنهکانی من بهو ئازاره گرفتار ببون فریایان کهوت
زۆربهشیان چاوێکیان له دهس دابوو چاوێکیان :بۆ مابوو
بۆ خۆم وهبیرم نایه بهڵام بۆیان دهگێرانهوه دوای له

دەس دانی چاوەکانم یانی ئەو چاو لە دەس چونە.
شوێنێکی خراپی لە سەر مێشك و روحم دانابو تا
ماوەیەك روو بە شێتی چوو بوم شەوانە هەڵئەسام
رام دەکردە دەری شاری زۆر جار لە چاڵاوو قوڵکە
دەکەوتم یا لە بان را دەکەوتمە خوارێ ناچار
شەوانە باوکم یا دایکم بە پشتێن لە خۆیان دەبەستم
ئەو جار ئەگەر هەڵستابام وەخەبەر دەهاتن٠
گوایە ماوەی دو ساڵ ئەمن ئاوا بووم بە کورتی
لە تەمەنی حەوت سالی دا باوکم نامی بەر قورئان
خوێندن و لای پیاوێك بە ناوی میرزا حەمە کەریمی
مەخرونی کە ئەویش کورێکی وەك منی بوو دوو سێ یەکی
دی لە لای ئەو پیاوە دەمان خوێند زۆر رۆژی واهەبو
پێکەوە دەسمان دەگرت و دەهاتین بۆ ینەوە ماڵێ
هەمومان یا لە بانی را دەکەوتینە خوارێ یا لە
چاڵێ دەکەوتین دەنا شتێکمان بە سەر هەر دەهات
ناچار لە چون و هاتنەوەدا یەکێکیان بۆ تەرخان
کرد بوین دەی بردینە لای مامۆستا و لە پاشان دەی
هێنایەنەوە باوکم تا بلێی خۆشی دەویستم زۆر جاران پێمی
دەکوت پێم خۆشە لە گەڵ حافزانی تر بم نیێری
سولەیمانی لەوێ دەخوێنم٠ لە جوابم دا هەمو جارێ

دەیکوت : شتی وا نابێ بێ تۆ هەڵناکەم بە داخـەوە

ئەو خوشەویستی یەی باوکم بە قازانجی من تەواو نەبـو.

چونکی باوکم نەی هێشت هەر لە منالێ وە تاڵ و سوێری

بچێژم و باشتر لە مەیدانی ئیمتیحانی ژیان دەرچـــم

هەستم بە ڕۆژە ڕەشی و بون و نەبونی نە دەکـرد

بەیانی کە نانیان بۆ دا دەنام دەمکوت نای خۆم تا

پێم نەڵێن بۆ ناهار چیمان هەیە ؟ ناهاریش دەبو بزانم.

بۆ شام چیمان دەبێ باوکم منی وا بار هێنا بـوو

پێم وا بوو ژیان هەتا هەتایە ئاوا ئەمێنی .

تا سالی ۱۳۲۰ی هەتاوی نیوەی قورئانم بە باشی

خوێند هەر لەو کاتەدا دەورو دوکانی ڕەزا شا تیـك

چوو ، حەمە ڕەشید خان هێرشی هێنا بۆ بانە ، دەور

بوو بە دەوری عەشیرە و بەگزادە هەر کەس بەیانی زووتر

لە خەو هەستابایە ئەو ڕۆژە حوکمەت بە دەس ئـەو

دەبوو باوکم و شەریکەکەی لێ بران لە بانە کۆچ بکـەن

ماڵیان بار کرد و لە بانە ڕۆیشتن حاجی بابای شەریکی

باوکم لە بۆکان گیر ساوە و باوکیشم چونکی دوو برای تری

لە سابـڵاغ بوون ئەویش هاتە لە سابـڵاغ( مەهاباد ) ـــ

نیشتە جێ بو لە سابـڵاغیش باوکم بردمێ مـزگـەوتـی

حاجی ئەحمەدی و سەر لە نوێ لە لای مەلایەکی حافـز

که ئەو کات لەو مزگەوتی بانگی ئەدا بە نێوی ماموستا مەلا حەمەدی حاجی بایزی لە بەر خویندنی نامەوە ئەو نیوەی لە بانەش خوێند بوم سەر لە نوێ دوپاتم کردەوە بە کورتی لە ماوەی هەشت ساڵان دا قورئانم تەواو کرد

لە سالی ۱۳۳۰ را زۆرتر خوم دا بە شێعر لە بەر کردن و رەوان کردنی شێعری شاعیرانی کورد و فارس کەیفم لە هیچی دی نەبو بەڵام باوکم ناچاری دەکردم کە هەر دەبێ بخوێنی تەفسیری قورئان و شەرع و عیلم و ... منیش هیچ وازم لە خوێندن نەبو هەر چونێك بو هێندیکم خوێند لە لای مەلا حوسێنی مەجدی هێندێکم عەروز و قافیە و لە لای حاجی مەلا خالیدی وەحیدی دەربەندی هێندیکم شەرع و لە لای قازی مەحەمەدی خزری لە شنۆیە هیندیك شەرع و عەقایدم خوێند ..

زۆرتری ماوەی ژینم لە گەڵ فەقێ یان را بوارد و لەهاتو چۆی حوجرەکان و لە ها موشۆیاندا زۆر شتیان لێ فیر بووم وردە وردە خوم دا بە شیعر کوتنەو زۆر جار شێعرەکانم لە بابەت شۆخی و هەجو و ئەوانەوە بووە . دوای ماوەیك هەر لە لای فەقێیان

گوڵستان و دیباچەی یوسف و زولەیخام خوێندن هەر لەو

کاتیشدا کە زۆر خوم دابو بە سەر شیعر کوتنـــدا

پێم خوش بو شیعری شاعیران تەخمیس کەم بـــەڵام

چونیەتی زیانم شوێنێکی قوڵیان لە سەر شیعرەکانـــم

دانابو بە چە شنێ کە زۆربەی شیعرەکانم تاریـــف و

زەمی خەڵکی بو زۆر جاران پێ یان دەکوتم ئـــەو

شیعرانە نوێ بکەمەوە باشە با بە خورایی نەچـن ·

دەمکوت شیعری من پایە و مایەیەکی وایان نییە

بە کاری دوا ڕۆژی بێن و بیان نوسمەوە لە سالی ١٣٣٥

لە شێوەی تاریف و زەمی خەڵکی لادا و هێندێکـــم

شتی تازە کوتن وەك کیژی سابلاغی و خەیاڵی خــاوو

بەهاری فارسی ــ یەکەمین شیعری فارسی ساقی نامە یەك

بو هی شێخ عەبدوڵلای تاڵەبانی کە تەخمیسم کـــرد

بە داخەوە نوسخەی ئەوم لە لای نەقێ یان لـێ ون

بـو · لە ساڵی ٥٦ و ٥٧ی میلادی ئیزگەیەکی کـــوردی

لە قاهیرە دەست بە کار بوو ڕۆژانە نیو ساعـــەت

بەرنامەی بـڵاو دەکردەوە زۆر هوگری ئەو بەرنامەیە

بوم و هەمو جارێ بە بیستنی ئەو بەرنامەیە هاســت

و مێشکم دەبوژاوە لە ساڵی ٥٨ی میلادی کە شۆڕشـــی

چاردەی تەموزی عێراق دەسی پێکرد بە تەواوی · هەمتـــی

من له باره‌ی شێعره‌وه گۆرا له سالی ٥٠ را بـــه
هۆی تێکۆشانی برایه‌کی خۆشه‌ویست فێری خـــه‌تـــی
برایل بوم ورده ورده ده‌ستم به خوێندن کرد تـــا
وه‌کو گه‌یشته ئه‌وه‌ی له تاقی کاری شـــه‌شـــه‌مـــی
سه‌ره‌تایی دا به‌ژداریم کرد

مه‌به‌ستی من زۆرتر فێر بونی خه‌تی نابینایـــان
بو ئه‌و خه‌ته له سه‌ت و بیست سال له‌مه‌و به‌ره‌وه
له فه‌رانسه ئیختیراع بووه و له سالی ۲۲ ها تۆتـــه
ئێران و له دوای هه‌موو ده‌وڵه‌ته‌کانی دی به‌کـــار
هێنراوه جا له مه‌و دووا هه‌ر چی ده‌مکوت بـــه‌و
خه‌ته ده‌منوسێوه یا له سه‌ر شریت تۆمارم ده‌کـــرد
له ساڵی ٤٤ی هه‌تاوی دا لێ برام په‌ندی پێشینیان
کۆ که‌مه‌وه و بیان هۆنمه‌وه له سه‌ر ئه‌و لێ برانـــه
زۆرم زه‌حمه‌ت کێشا ده‌مناردە دیهات په‌ندیان بۆ کـــۆ
ده‌کردمه‌وه ئه‌منیش ده‌م هونده‌وه فه‌قێ یه‌کانیـــش
بۆیان ده‌نوسیمه‌وه به‌ڵام داخی گرانم چه‌ته‌کانـــی
ساواك رۆژیکی هێرشیان هێنا بۆ ماڵه‌که‌م ئه‌و په‌ندانـــه
و هێندیك له دیوانی شاعیرانی دیـــم لـــه ماڵێ بـــو
له گه‌ڵ خۆیان برد زۆرم هه‌وڵ دا وه‌گیرم که‌ونه‌وه
بۆم نه‌گونجا و زه‌حمه‌ت به خسار چوم.

هاوارم بۆ ئیمام جومعەی ئەو کات برد تا بەڵکو
هەوڵم بۆ بداو شێعر و کتێبەکانم بۆ وەرگرێتەوە
لە وڵامم دا کوتی: تازە لێیان گەڕێ و وەدویان
مەکەوە ئەگەر بە قسەی منیش دەکەی واز لە شێعری
کوردی بێنە. ئەو قسە ناخۆشترین قسەیەک بو
تا ئەو کات بیستبوم وەك خوێ بە برینانم دا کرابێ
بۆ ماوەیەکی ناهومێد و کاس ببوم لە ئاخری
ساڵی ٥٦ی هەتاوی لێ بڕام هەر چونێکی بێ وەبیر
خۆمیان بێنمەوە دوای بیر کردنەوەیەکی زۆر ئەوەندەی
ئێستا لەو دیوانەدا هەن وەبیر خۆم هێناوەتەوە
و کۆم کردوونەوە. بە راستی لە سەر ئەو شێعرانە
کوێرەوەری زۆرم کێشاوە ئەو کات کە بە هیمەتی تۆی
دڵسۆز نوسیبومنەوە لێم ببونە بەڵا و هەر رۆژەی لە
قوژبنێکی دا لە ترسی ساواکی دەمشاردنەوە تەنانەت
ساڵێك ناردمنە سەردەشت تا وەکو راپەرینی گەورەی
ئێران دەستی پێکرد وردە وردە هێنامنەوە لای خۆم
و ئەوەندی توانیم بە شریت لە ئیختیاری خەڵکم
نان پاش بیست ساڵ ژیان لە شاری سابلاغ بە
هۆی گیر و گرفتی ژیان باوکم ناچار بو بەرەو بانە
بگەڕێتەوە باوکم بەرەو بانە گەراوە و منیش تەنیا

لێرە مامەوە بەردەی تاڵی ژیانم لێرەدا تاریك و لێڵ تر بو تا خافڵ لێم تەوماو لە باوکم هەڵبڕام بە داخەوە لە وڵاتی مەماناندا ئینسانی کوێر مەحکومە بە سواڵکردن ژیانی بەرێتە سەر بەڵام ئەمن دوو مانگ بە سیغار و بلیتی بەختی ئازمائی فرۆشتن رامبوارد بەڵام داخی گرانم ئەوی همشم بوو بە دەستمەوە نەما چونکی ئی وا هەبوو بلیتی کۆنی دەدامی و بە تازە لێی دەگۆڕیمەوە ٠

هیچ چارم نەمابو لە گەل تاقمێکی دی لە حافزان چومە دەرەوە بۆ گەران جاری ئەوەڵم بو زۆرم لەبەر گران بو دەست پان کەمەوە و داوای خێر و ئیحسان بکەم٠ هەر لە بەر ئەوەی ئەوانەی لە گەڵم بون بۆیان داوا دەکردم

ناخۆشترین دەورانی ژیانم دەستی پێکرد هەر شەوەی لە دێیەك و لە مزگەوتە کونێك دەماینەوە بە خراپترین جاجم و لێفەی کۆن و پیس دەنوستین تا حەو تومان لێ تێ وەر دەسوراوە لە بەر چڵك و رشك و ئەسپێیان ئۆقرەمان لێ دەبرا دەردی چاو ساغیش سەرەرای هەمو دەردان بو لە گەڵمان ریك نەدەکەوتن ئەوەی بەیدامان دەکرد دەبو لە گەڵمان نیوە کردبان ئەوندی

پەیداش کرا بوبە کەیفی خۆیان بو • ئەوەی لە ماوەی بیست
شەو یا مانگێك گەڕان و سوڕانەوە دا دەمان هێناوە
حەو تویەك ژیانی ئێمەی دا بین نەدەکرد دەبو سەر
لە نوێ بڕۆینەوە دەرێ

هەرگیز لە بیرم ناچێ جارێکی لە حافزەکان
هەڵبڕا بوم وَ بێ چاو ساغ بە ماشێنی لە شنۆیە
را هاتمەوە نەغەدەی بە تەنیا لە ناو بازاری نەغەدە
دا دەخولامەوە ئێوارەیەکی درەنگ و کاتی دوکان
داخستن بو سەرم لێ شیوا بو نەمدەزانی روو لە
کوێ کەم لە پڕ توشی ئاشنایەکی لە مێژینەم بوم
ئەوکات رەئیسی دادگای نەغەدە بو و لە نێو نەتێیان
لەگەڵی ئاشنا ببوم زۆر بە گەرمی چاك و چۆنی لەگەڵ
کردم و زۆری پێ سەیر بو منی لەو حاڵەدا دی ــ
پرسی بە تەنێ بۆ هاتویە ئیرە و چ دەکەی ؟

ئاوەڵەی شەرمم لە روی نیشت نەمئەزانی چی
جواب دەمەوە بڵێم لە سواڵ کردنێ بووم نانا
هەرگیز. چونکی رۆژێك ئەو منی بە جورێکی دی دیبو
جوابم داوە سەرێکی شنۆیەم دا نەختێکم کار هەبو ••• بە-
ڵام دەم و چاوی سوتاوو رەنگی رەش هەڵگەڕاوو چڵکنی
بەرگ و لەش و گۆنای تێك قوپاوم زۆر چاك نیشانی

ئەدا لە کوێ بـــووم و لە چــی گــەراوم ٠

تێگەیشت ئەگەر زیاترم لــێ بکۆڵێتەوە بە خۆ-دا -
دەشکێمــەوە ، دەستی گرتم و بردەمێ میوان خانــەیەك
وپێی گوت ئەم مامۆستایە ئەو شەو میوانی منــە و دەبێ
نان و جێ وبانی خۆشی بۆ خەرجەکەشی لە بـــــاڵای
من بە یانیش ماشێنی بو بگرە وبینێرەوە سابـــڵاغی . کاتێ
گەیشتمەوە ماڵێ ئەوەندە بە خۆم دا شکا بومـــــەوە
دوو رۆژان نانم پێ نــەخورا قەسیدەیەکی دورو درێــژم
لە مەڕ چلۆ نایەتی ژیانم هۆنیوە و بۆ ئەو دۆستـــــەم
نارد لــەم قەسیدەیە دا چۆنیەتی ژیـــانی خۆم بـــۆ رون
کرد بۆوە و سپاسی خۆم دەربریبـــو لــەو هەمو ریـــزەی
ئەوێ شەوێ لێمی گرت ٠

بە راستی هەرچــی لە بارەی دیوەزمەی ژیانمــەوە
بڵێم هەر کەمە تەنیا دڵخۆشیم بەوەیە نوسراوەکانــــــــم
دەگەنە دەستی خەڵك و بە ئاواتی دێرینم دەگەم ٠

رەســـــوڵـــی رەش ئـــەحمــــــدی

١٥/ ٧/ ٦٢

ئەوە کورتەی وتو وێژیك بو لە گەڵ شاعیری دڵ روون وخاوەن
هەستی کورد مەلا غەفوری دەباغی ناسراو بە حافزی کــوردی ٠

## ستایش بۆ یەزدانی مەزن

حەمد بۆ خوای بەرز و بێ هاوتا
خالیقی مەخلووق بێ باك و تەنیا

راگری زەوی و حەوت ئاسمانە
بەری لە وەهم و شك و گومانە

بە قودرەتی خۆی لە یەك قەترە ئاو
جوانترین بەشەر دینێتە بەرچاو

رۆژی ئەو دەخۆن گەلی گیان لەبەر
هەر بە دەس ئەوە قازانج و زەرەر

هەرچی ئەو بیدا نابڕێتەوە
هەرچی ئەو بیبا ناگەڕێتەوە

بە یەكێ ئەدا ماڵی زۆر و گەنج
بە یەكێ ئەدا موشەققەت و رەنج

یەك بە خێر ئەكا بە ناز و نیعمەت
یەكێ دەخاتە ژێر باری زەحمەت

یەكێ تێر دەكا لە گۆشت و پلاو
یەكێ كوێر دەكا بۆ جۆری شۆرباو

یەكێ گەرانی بە كادیلاكە
یەكێ بە پێ یان ماندو و هیلاكە

یەکی رادەخا فەرش لە بەر پێ
یەک لە سەر حەسیر گیانی دەردچێ

یەک سورانەوەی بە توبوتایە
یەک ماندو و مردو هەتا هەتایە

یەکێ بەدەنی وەک گرێ دارە
یەکێ دوازدە مانگ لەشی بیمارە

یەکێ منداڵی زۆر و بێ خێرە
یەکێ تا دەمرێ هەر وەجاغ کوێرە

یەکێ لە باخەڵ ناسک و نازدارە
یەک هاورێ لە گەڵ ورچی نێو غارە

یەکێ پەری روو دێتە باوەشی
یەک دیلە دێوێک بۆتە هاوبەشی

یەکێ دەکاتە گەورەی خاس و عام
یەکێ دەنوێنێ لە تونی حەمام

بە یەکی ئەمدا عەقڵی ئەفلاتوون
یەکی دەکاتە واریسی مەجنون

یەکێ دەکاتە قوتبی رەببانی
یەکێ دەکوژێ بە بێ ئیمانی

یەکێ زانایە ژیانی تاڵە
یەک گەوج و نەزان بە ماڵ وحاڵە

یەکێ دانیشتووی کۆشک و تەلارە
یەک بە ئەرمەنی و جوش قەرزدارە

یەکێ حیسابی رەدبو لە ملیارد
یەکێ شک نابا لە ماڵ پوتێ ئارد
یەکێ شیک ترین جل لە بەریایە
یەک لە تەندورخەی بۆ سۆی لێنایە

یەک گرانترین پارچەی دادڕی
یەک تورەکەی سوار ئەستوی دابڕی
یەک کوشک و سەرای لێ بەجێ ماوە
یەک شارەداری لە قەبری ناوە ( مەبەست لە

یەک بە دەست ودڵ یەکێ چروکە
یەک ئێلدگران یەک رەزا سوکە
یەکێ دەست لە مل یاری چاو بازە
یەک چاوی خیڵ بو لەبەر دەروازە

یەک ماڵی پڕە لە تەخت و گازۆڵ
یەک هەڵدەلەرزێ لە بەر سەرماو سۆڵ
یەکێ خاوەنی سەروەت و ماڵە
یەکێ تا دەژی روت و رەجاڵە

یەکێ خاوەنی پێزو و پەیکانە
یەکێ لارەمل لە قوون دەرکانە

یەک بە دەستی پڕ بۆ ماڵ دێتەوە
یەکێ بێ شێو سەر دەنێتەوە

یەکێ بێ حەد و حیسابە ماڵی
یەک بە خێو دەبێ بەنانی سواڵی

یەکێ دەباتە نێو ئاپارتومان
یەک دەخزێ نێتە بەندی خانەکان

یەکێ ئارەقەی نایەتە نێو چاو
یەکێ دەبرژێ لە بەر سورە تاو

یەکێ خاوەنی سەروەت و ماڵە
یەکێ تا دەمرێ روت و ڕژاڵە

بە یەکێ ئەدا دینار بە خەڵوار
یەکێ سەگ و نان دەکا قەرزدار

یەکێ نان لە دەم سەگ دەرفێنی
یەک هەزار پوڵ دەدۆڕێنێ

یەکێ سوبحانەی هەنگوین و رۆنە
یەکێ سێ زەمەی شێرێژی کۆنە

یەک پارچەی ناپاب دەکاتە بەرگی
یەک لە بەر روتی دەخوازێ مەرگی
یەک پوڵ و پارەی بە سود دەگەڕێ
یەک سەری مانگێ رەنگی دەپەڕێ
یەکێ رۆژ و شەو مەست و سەرخۆشە
یەک لە سوێی گۆشت و چەوری نەخۆشە

یەکێ نەهاری قەل و مریشکە
یەکێ دۆی ترش یا نانی ویشکە

یەکی مەکینە سەرگی دەشۆرێ
یەک لەدەست تەنگی ژنی دەتۆرێ

یەک هەمو ساڵێ دەچێ بۆ حەجێ
یەکێ بەر بینگی دەگرێ پور خەجێ

یەک پوڵی زۆرە ژنی دەدەنێ
یەک ماوەی ژینی دەنوێ بەتەنێ

بە یەکێ ئەدا چەند دەستە خانو
یەک دادەمێنی بۆ کرێ خانو
خۆی لە هەمو کەس باشتر دەزانێ
مەرد دەباتە لای نامەرد بۆ نانێ
کەسیش ناوێرێ بێژی خوایە
بو وات کردووە و لە بەرچی وایە

## پەندی پێشینیان

ئەگەر قسەی حەق لە من دەپرسی؟
تێر ئاگای نییە هەرگیز لە برسی

بە قەول وقەرار قەت مەخۆ فریو
بە هیوای جیرانە ویشکە تیکوشیو

گوێ بگرە زەریف بۆ ئەم نەزیلە
مەسپێرە هەرگیز دوگ بە پشیلە

هەرچی خۆت نەی کەی بێ سودە کاکە
بە دەستی خەڵکی مار بگری چاکە

لە نیو خاس و عام ئەم قسە زۆرە
ماڵی خۆ نەخۆر بۆ چەکمە بۆرە

لای گەوج و نەفام نەسیحەت بایە
یاسین بو گویلك بلوێر بۆ گایە

ئەو کەسەی کورەی نەوسی لە جۆشە
وەك کەری ماندوو محتەلی چۆشە

ناتەواوی هەوی قرە و جەنجاڵە
بەلام سفرەی پڕ هێمنی ماڵە

کە ناعیلاجی روی کردە ماڵت
حەریفی دایکت دەکەی بە خاڵت

پیاو قەرزی کۆن وخزمی دوور ولات
دێنێتەوە بیر گەر زۆری بۆ هات

خزم بە کاری قیامەت نایە
مەعلومە دنیا هەر بۆ دنیایە

بەو کەسە دەڵێن عاقڵ و وشیار
دوو جار لە جێ یەك پێوەی نەدا مار

بە کەسێك دەڵێن عەقڵی تەواوە
خەمی نان بخوا شوتی هەر ئاوە

جارێکت خواردم بە سندانت بێ
دو جارت خواردم نۆشی گیانت بێ

گارانە کەیان رادا بە زۆری
تازە دەپرسێ لە مانگا بۆری

ئاوری بن کایە بۆ سوی لێ نایە
دزی خۆ ماڵی لە گرتن نایە

دز و خاوەن ماڵ گەر ببنە هاو دەست
گا لە رۆچناوە دەردێنن بێ هەست

ئەگەر بکەویە بەر هەڵمەتی شێر
قەت پەنا مەبە بو رێوی بێ خێر

جوابی قوزەل قورت ، سندان و دەردە
پێشینە دەڵێن جۆی کڵۆ بەردە

وەختێک دەزانی مەعنای حەوسەلە
بە کەوچکە ئاوێ نەکەویە مەلە

زانیت کە حەریف لە خۆت زیاترە
شەڕی خۆ تریێن نەکەی چاترە

دەستێک نەتوانی بی بڕی لە بێخ
دەبێ ماچی کەی وەک جەنابی شێخ

مردم لە داخی ئەوزل پانیرە
خۆی کردە وشتر لە ترسی گیرە

وا مەشهورە ساڵ هەوەڵ بەهاری
خۆشی و ناخۆشی دەکا دیاری

نەهاتە بەر بار ئەگەر کەری زل
بۆخۆت بۆی بەرە بەشان و بەمل

وایان فەرمووە پیاوانی زانا
کوە چوو بۆ ریش سمێڵی دانا

بیستومە لە زۆر پیاوانی ماقوول
شەر بە شمشێر و مامەڵە بە پول

میوان نایه وێ سفره رەنگین بێ
نانت جۆیین بێ و خولقت گەنمین بێ

پیاوی میوان گر چوو بۆ هەر جێ یه
بێ منەت نان و خوانی خۆی پێیه

هەلاتن عەیبه بۆ پیاوی شەر کەر
بەلام هێندی جار پێی دەلێن هونەر

خوای تەعالا کار بێ جێ ناکا
تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا

بۆ ئەم نەزیلەش گوێ را بدیره
چێشتی پڕ کابان بێ خوێ یا سوێره

کەمێ نەگبەتی بێته سەر شانی
بەلۆلە بخوا دەشکێ ددانی

ئەگەر گلۆلەی تۆ کەوتە لێژی
بەتەما مەبە کەس چاکت بێژی

حەز دەکەی دوور بی لە گێژە و کێشە
بە قەت بەرەی خۆت پێ رابکێشە

پێم خۆشە گورگی ولاتەکەی خۆم
بم خوا نە وەکو شێری عەرزە رۆم

ئـــەی خـویـن مـژی گـەل تا زووه بمـــره
دەڵێـن سـەگـی هار چـل شەوی عـومـره

زگ گـورگـی سـەر مـەر بۆ وا فـەقیـــری
خـۆ تـــۆ هەوینـی نـۆ مەنجـەل شیـــری

هـەرچـی میروولـە کـردی بـــە ساڵـێ
وشتـــر لێـی دا هـەر بـە قـــە پاڵـێ

ئیـــش بە بـێ زەحمەت محـاڵـــە بوونـی
پیـــاو ماسی بگــرێ تـەر دەبـێ قـــونی

ئـاوت خــواردەوە جـارێـك لـــە کـانـــی
بـەردی تێ مـەخـە خۆ تـۆ ئینسـانـــی

لـەگـەڵ کـێ خـواردت چایـەکـی تـاڵـی
خەیا نەت مـەکە بـە سـەر و مـاڵـــی

خـوت ناحـەز مـەکـە لـــە کـن تەڵـەبکـار
حیسـاب بە دینـار بەخشیـن بە خـــەروار

هیچ عەیـب نـاکـــەی دە بـــوو دا رزی
رەفیقـــی قـافڵـــە و شـەریکـــــی دزی

شـایـــی لـە گـــەل گـورگ ئـەکـەی بە درۆ
بـــۆ مـەریـــش دەکـــەی شیـوەن و رۆرۆ

هیوام پیێت نییه زل و بۆ خێری
بەکەر ناوێری بە کورتان شێری

ئەوی دۆست دەیکا پێی ناکرێ دوژمن
هەر جارێ ناشتا دەکا درۆزن

جێی سست و زللە پێلەقەو شەقە
لە قەدیمەوە قسەی حەق رەقە

پیاو بە خزم و دۆست دەبێ کوڵەوار
ناقەڵشێ هورە لە خۆی نەبێ دار

لەگەل ئەم بیرو باوەرە چۆنی
دەڵێن چێشتی خۆش دیارە بە بۆنی

زۆر بە نەفامم دیتە بەر نەزەر
کەسێ لە ئەسپ دا بەزێ بۆ کەر

دار ویشک دەبێ بە ئاواتی باز
جارێک لە سەری بخوێنێ ئاواز

بیستومە پارووی لە زار بکەوێ
بۆ کۆش چاکترە نەک ئیترە و ئەوێ

ناحەقی کرا لە منی هەژار
جا فەرقی چییە چ گورگ و چ سوار

پیێی ناوێ ئیتر ئەم فاك و فیکە
ئەگەر بەزد دوورە خۆ گەز نیزیکە

بجۆرە جێ یەك هیچ كەس نەمت ناسێ
خۆت هەڵ بکێشە پڕ بە کراسێ

بە ڕۆژ دەگەڕێ بە کراسی کەتان
بە شەو دەچێتە نێو کوڵی کورتان

ئەوەی لە لای تۆ سووك و بەدناوە
لە کراسی خۆی دا وەکو تۆ پیاوە

شوێن کڵاوی خوار مەکەوە خاڵە
فەرز لەوێ بێ سوننەت بەتاڵە

خۆ بە کوشت مەدە بۆ پاروی گەورە
بێ بەڵا نییە ئەو دووگە چەورە

هیچ سودی نییە ئیشی بە پەلە
هەر بۆ کاری خێر باشە عەجەلە

دوست ئەو کەسە یە کە بتگرێنی
دوژمن ئەوەیە پێت بکەنێنێ

دوژمنی زانا دەتکا سەر بڵەند
دوسی بێ شعوور هەر دەتکا بەپەند

ئەو کەسە پیاوە بەخۆی نەخوریٚ
هیچ کەس لە پەریٚ نەبوە بە کوریٚ

مەشهورە دەڵیٚن بەرخ هەتا سەر
لە بن سەوەتە نابیٚ دیٚتە دەر

ناحەقتە ئەگەر هیوات نەبیٚ پیٚم
من بەرخی نیٚرم بە کارت دەشیٚم

بە قاپیان نییە ئەسپ و ژن و چەک
بیجگە لە مانەش زۆرن بۆ ئەمەک

نانت بخە بەر سەگی بۆ زمان
مەی دە بە پیاوی سپڵەو پیٚ نەزان

ئەم قسە گەلیٚ کۆن و لە میٚژە
مرد و ئەگەر مرد لینگی دریٚژە

لە قەدیمەوە ئەم قسە تاوە
کویٚر هەتا دەمریٚ بە تەمای چاوە

دۆستی کەسیٚک بە کاتی فەرعانە
بەجیٚت نەهیٚڵیٚ ڕۆژی تەنگانە

ریٚوی بەتەنیا لە کون نەدەچوو
هەزگەلیکی شی دەکیٚشا لەدوو

ئه‌گه‌ر کویه رۆن به‌ تاڵ بوو سه‌ری
گوریه‌ وه‌فای بێ ناچێته‌ سه‌ری

ئه‌گه‌ر مه‌یلیان بێ سوار و پیاده‌
ده‌بن به‌ هاوریێ کوێره‌رێ و جاده‌

به‌رگه‌ که‌م شڕه‌ لێمان ببوره‌
که‌وای سوور پڵاو ده‌خوا مه‌شهووره‌

ئه‌مه‌ش فه‌رموده‌ی قه‌دیمێکانه‌
به‌رد له‌ جێگای خۆی قورس و گرانه‌

قسه‌ی قه‌دیمی له‌ که‌س مه‌پۆشه‌
دۆم هه‌تا رووت بێ مه‌زاقی خۆشه‌

ئه‌گه‌ر نه‌م دیبا جه‌نابی باوکت
بێشك ده‌مردم ، له‌ عه‌زرمت دایکت

له‌ شار و لادێ ئه‌م نه‌قڵه‌ باوه‌
گیای شین به‌ جێگای سه‌خته‌وه‌ ماوه‌

ئه‌م قسه‌ ئه‌گه‌ر تاڵێشه‌ حه‌قه‌
دۆ هه‌تا زۆر بێ که‌شك هه‌ر ره‌قه‌

دوو رو هه‌ر وایه‌ پیشه‌و ره‌فتاری
هه‌م له‌ ناڵ ئه‌دا هه‌م له‌ بزماری

ئەگەر دوڕاندی پیاوی تومارکەر
نەلێ بە گوونم دەبێ سەوداسەر

قەدیمی دەڵێن بۆ دەستەوەستان
هیچ فەرقی نییە گەرمێن و کوێستان

زۆری شوور لێ هەڵ مەکێشە کاکە
ئاو لە ئاوەڕۆ دەرنەکەی چاکە

سەگ پشت ئەستورە پەلا مار دێنی
بە قەوەی کلکی ئێسک دەشکێنی

سەفەر و سەودا دوو بەڵگەی چاکن
تاقی کەرەوەی پاک و ناپاکن

رەنگە دەرنەچی لە ئیمتحانم
ئەگەر عەیبی تۆ تەواو بزانم

عەیبەکانی خۆت بێتە بەر چاوی
رەوا نابینی بەکەس بەد ناوی

مەشهورە دەڵێن خزم بەددان
گوشتیشت بخوا ناشکێنی ئێسقان

کەس بە ڕواڵەت لێت مرج و مۆنە
خوێن نابێ بە ئاو نەزیلەی کۆنە

هەر خوێنەك مرۆ گرتی بە شێری
بۆی تەرك نابێ زەمانی پیری

تازە خوت دەكەی تۆش دەردەسەری
بە پیری سەری كەڵاش می كەری

بۆ ئیشی بچووك قەت تێ مەكۆشە
گوێم هەتا قوڵ بێ بۆ مەلە خۆشە

ئەوی نەفام و بێ هۆش و گوێیە
كوتەك دەزانێ تۆ ناغی كوێیە

ئەمینی خەڵكە پیاوی داوێن پاك
ئالك زیاد دەكا لەخۆی ئەسپی چاك

دۆستی بەراستی كوا ئەم زەمانە
زۆرتری رەفیق بۆنان و ........

بە دەس مەسی قاڵ بكەی بە هەویر
نەك دەستە و نەزر لە خزمەت ئەمیر

تاشە كەمان هەر ئەوەندە دێنێ
كاكی ئاشەوان خۆی بی قرتێنێ

گەورە بی خەرجی پێویستە مەگری
كێ بانی نۆرە زیاترە بەفری

وەک خۆ هەڵ کێشان عەیبێکی زلە
بە کەروزانەوەش دێتە خوار پلە

بەکەر ناوێری زلی بۆ حونەر
رەپە رەپ دەکا بە کورتانی کەر

دەزانم لای تۆ ئەم قسە تاڵە
قەباڵە ، ئەگەر زۆر هات بە تاڵە

هەتا قەباڵەی خوێندەوە رێوی
کەوڵی لە حاجەت خرا لە کێوی

ئەوی پاش ملە شا سەر دەبڕێ
شەرتە ئاشکرا قسەی دەربڕێ

کەو ئەو کەوەیە بەرانبەر بە کەو
بخوێنی ، ترس و باکی نەبێ لەو

لە مردن ترسی نییە کوری شێر
هەر بۆ سەر بڕین چاکە بەرخی نێر

بەو مەرگە دەڵێن جێژنە، پیرۆزە
کە لە گەڵ گەل و ئاواڵ و هۆزە

براگیان هێشتا ئەسپ نەکراوە
ئاخور هەڵبەستن خەیاڵی خاوە

هەتاکو ماوین هەوڵێ هیمەتێ
من تۆم بۆ چییە لە قیامەتێ

ئەوانەی خاوەن باخ و بێستانن
خەجاڵەت باری چلەی زستانن

گۆشت خۆرن هەموو دەعبای ئەم ناوە
کەچی هەر نێوی گورگ بەد ناوە

تو پێت رەوادیم ئەم کارە جوانە
نەقلی کەڵاشی ، مام ئاشەوانە

دیارە هەموو کەس خۆشی دەوێ نان
بۆ لە سەر دڵی دادەنێ گاوان

قەت لە شوێن چووان نەچێوە چاکە
بەس لێر و لەوێ کای کۆن بە باکە

پیاو لە دۆستی کۆن نابێ واز بێنێ
ئاو دەروا هەر زیخ بەجێ دەمێنێ

ئاو بەت با مەچۆ سەر پردی نامەرد
چش با بخنکێ بە سەد ئێشو دەرد

پەسەندتر بووە چ ئێستا چ زوو
ڕێوی گەریدە لە شێری نووستوو

زنی مالان گەر دەکەوێتە سواڵ
پیاوی زگەڕۆ قەت نابێ بە ماڵ

وتیان بە گورگ تۆ دەبی بە شوان
دەستی کرد بە قوڕپێوان و گریان

وتیان بۆ دەگری خۆ کەسپی چاکە
وتی دەترسم درۆ بێ کاکە

ئەم دیوە ئیشی هێندە ناقۆڵا
بە سەر دری خۆی ناقابلە جۆڵا

شوان دەلێن شوانی بێ ئیفتیخارە
نان چنینەوەی لا عەیب و عارە

هەر کچێک دایک تاریفی دەکا
بۆ خاڵی دەبێ شو بەوی دەکا

بیستومە دەلێن رەسووڵی ئەکرەم
سڵاوی خوای لێ بێ هەموو دەم

فەرمویە هەتا رۆژی قیامەت
چوار شت لە چوار شت تێر نابێ قەتقەت

ژن لە مێردی باش، زەوی لە باران
ئینسان لە عیلم و چاو لە رووی یاران

مانگا با کەڵیش بگرێ بە دزی
ئاشکرا دەزێ بێ دزی و فزی

سێ شت خەم لە دڵ دەردەکەن تەواو
رووی شۆخ و شەنگ و شینایی و دەم ئاو

وەک فەرمویانە پیاوانی حاڵی
قەت بۆ گا نابێ گوێلکی خۆماڵی

پەندێکی تریش هەیە لەم بارە
دەڵێن گای جووتی بە گوێلکی دیارە

قەدیمی دەڵێن درشت و وردی
زۆر سەیرە گڵمەت بگری بۆ بەردی

مریشک بۆ خۆی وەسەر نەکا خۆڵ
ناکرێ بە سەریا بە هیچ شان و قۆڵ

لە قەدیمەوە خواوەندی زانا
بۆ هەر زاڵمێک زەواڵی دانا

لە ئاشی زۆرت بێ چووە لەمەرێ
وە پەلەکەوتووی زوو بگەیتە جێ

لە سورت دۆراند بە خێر نەیەوە
لە کار خەریکی تێی هەڵ دێنیەوە

ئاوا بەڕێوەی دەبەی کار و بار
بە زستان تومار بە هاوین شوکار

سەرباری خەڵکە تەنبەڵی بۆ خێر
دەستی ماندووە لە سەر زگی تێر

ئەمەش پەندێکی جوان و دێرینە
نوێژکەر نوورینە کارکەر شیرینە

ئەو ڕۆژە هەردێ سەرکەوی لە کەل
بەو مەرجە بەجێ نەمێنی لە گەل

وا مەشەوورە شوان هەتا بخەوێ
مەرەکەی زیاتر لێ دوور ئەکەوێ

نانێ ڕۆژ پەیدا بکەو نانێ شەو
هەڵ مەگرە هەرگیز منەت لەم و لەو

هەموو هەوی سواران هیچیان پێنەکرا
بە شڵپەشڵپی پیرێژن چ کرا

دەزانی ئەوی زیر و بەهرە
خەتی خوار لە بن سەری گای پیرە

شوێن بۆ سەر پیشەی خۆی دەچێتەوە
گیا لە سەر پنجی خۆی دەڕوێتەوە

ئەمەش بزانە پیاوی وریا و ژیر
شانازی ناکا بە باب و باپیر

بەمن چی دوێنی باوکی تۆ خان بوو
خاوەن دیوەخان سفرە و میوان بوو

شەرتە تۆ ئیمڕۆ غیرەت بنوێنی
بۆ خۆت بەرەی خۆت لە قوڕ دەربێنی

دز دیواری کۆن ئازا دەبڕی
بمرە هەر لە لای تەنکی دەدڕێ

ئیمڕۆ بخەوی بە تەمای سۆزی
لە قوژ بنێکا گەنجێ وە دۆزی

روو بە روو دەبی لەگەڵ ژینی تاڵ
چونکی بە خەیاڵ کەس نەبووە بەماڵ

بەڕۆژ بگەڕێی بە تاڵ و حەتاڵ
شەو بە دەستی پڕ ناچیتەوە بۆماڵ

کێ ڕۆژی ڕووناک چرای هەڵکرا
شەو نەوتی نابێ بیکاتە چرا

تا شێوت جەورە دێنە دەورت کەس
باوک بێ برا، ئامۆزا فەرەس

ساوەر نە سەیری ئەم نەقڵە خۆشە
من دەڵێم نێرە ئەڵێ بێ دۆشە

زۆر کوتن قورئان خۆشە دیارە
قە هەزارە دوویان بەکارە

پێی ناوێ ئیتر ئەم بەیت و باوە
مزگەوت روخاوە میعرابی ماوە

کۆنە بەرگی خۆت پینە و پەرۆ کەی
نەک تازەی خەڵکی لە بەرە خۆکەی

هەنگوینی خەڵکی کەدەس نەدا بۆت
قەناعەت بکە بە دۆشاوی خۆت

پشیلە دەمی بۆ دووگ نە دەچوو
دەیکوت پێم ناخورێ چەن سوێرە پەگلوو

سەگ ئەگەر نەمرێ لە قەساب خانە
لێی ژایە دەبێ ئەو عومرە جوانە

برا وا چاکە نەی کەمە لایی
برامان برایی کیسەمان جیایی

سەر و ماڵ لە تۆم دریخی نی یە
بزن لە سەت تەمەن هیچ کەمی نییە

پیاو ئەگەر لە زن لە بەهانە بێ
کارە کانیشی عاقلانە بێ

پێی دەڵێن ئەگەر ئارد دادەبێژی
خۆت بۆ بادەدەی تۆ مەگەر گێژی

کاکە زۆر بۆ لای خۆتی مەتاشە
نەشیش بسووتێ نە کەباب باشە

ناتەواوی هۆی قرە و جەنجاڵە
بەڵام سفرەی پڕ ئاشتی ماڵە

لێم روونە کە تۆش نەبی بەیارم
بە یاری خودا دەسازێ کارم

کە وتیان خاسە زو هەڵ مەماسە
بە خاسە خاسە گو مەکە کاسە

کور کور بێ چاوی لە میرات نییە
کورێ کور نەبێ ماڵی بۆ چییە

مار خۆشی نەهات لە سیری بێ عار
لە بەر کونە کەی شین دەبو بە بار

بێگانە وەکو بوت بێ پەرەستی
ئاخری و عاقیبەت دێنێ نشەستی

بیستومە لە زۆر پیاوانی رۆشن
فەقیری خۆشە قورتی نا خۆشن

کۆ دێتە ماڵت را نەخەی قاڵی
ئەگەر بە ماڵی بە مام و خاڵی

مەنازە بە بوون مەگری بە نەبوون
هیچی تا سەر نین نە بوون نە نەبوون

ئەم قسە گەلۆ بە سوود و کەڵکە
پیاوی خۆش حیساب شەریکی خەڵکە

ئەو کەسەی راستە و حیسابی پاکە
لە حیساب کێشان بۆ ترس و باکە

لە چاکەی کەسی زاڵم مەتۆرە
مویەک لە بەراز بێتەوە زۆرە

ناشکوری مەکە بەم بەشە کاکە
لە قور ئەوەندە تۆز هەستێ چاکە

لە هەوراز و لێژ قەت مەڵێ کوتن
لە بەر با هەرگیز مەکێشە تووتن

بە زاوا بەندی هەتا کو مردن
نەکەی بچێ سەر ماڵە بابی ژن

چێگات نە لێژە نە خوار و خێچە
هەر خەوت نایە بیانوت کێچە

خۆت لێ نەگوڕێ گەر بویتە گەورە
مەشهورە دنیا بە پێچ و دەورە

پیاو کارێک بکا کەیفی بوەستێ
دوو شووتی هەڵنا گیرێ بە دەستێ

تێر نابێ چاوی تەماع لە دنیا
کوڵێک هەڵگرە نە پسێی لە بنیا

بیکە ئاڵقەی گوێ ئەم پەندە جوانە
هی پیرە مێردە قەدری بزانە

تەماع سویراوە وەک ئاو دەنوێنێ
تا بیخویتەوە تو نیەتی دێنێ

تەشوێ بی ناوت نایەن بە باشی
چونکە هەر بۆ لای خۆتی ئەتاشی

رەندە بی هەموو رەنجت بە بایە
لە هەشتی مشتی بۆ لای تۆ نایە

ئاکارت وەکو مشار بێ باشە
هەم بۆ لای خۆتە هەم بۆ ئەولاشە

تاقە کراسێ بدری بە پیسی
هەزار بە پاکی بدرە هەر پیسی

گەر بە درۆزن نێو بانگت رۆیی
بێ نرخی لە لای بێگانە و خۆیی

بەو کەسە دەکرێ بڕواو متمانە
پابەندی وەفا و عەهد و پەیمانە

کەسێ راست نەبێ قەول و بڕیاری
بیخاتە پشت گوێ شەرت و قەراری

گەورەش بێ لە ناو کۆمەڵ بچووکە
وەك پووڵی قەڵب سووك و چرووکە

سوور نەبی لە سەر وەعدەو بەڵێنی
گەنجی دونیات بۆ پووشێك ناهێنی

بێ دا بنشین تاوێك دوو بە دوو
بێ ژنگێك دانێین لە بەینی هەر دوو

دەروانینە یەك لە ڕوی تۆ بینی
ئەو تۆت دەبینم کە تۆ دەمبینی

من چەندە بۆ تۆ دەکەم دیاری
تۆش هەر ئەوەندە لە منەوە دیاری

هەتا خاوەن ماڵ دزی گرتە دەست
دز خاوەن ماڵی گرت و دەستی بەست

ئەوی لە پوشێک نەکوڵێتەوە
لۆدەکای بەڕن ناپرسێتەوە

بەو کەسە ئێژن جوامێر و ئازا
بەخشین لە دوژمن نەکا تەقازا

بەس لە مە زیاتر خۆت گێل و کەڕ کە
ئەو ماستە بۆ مو نی یە باوەڕ کە

خۆش باوەڕ نەبی بەو حەددە چاکە
ئەو هەویرە ئاو زۆر دەبا کاکە

ناپاک هەمیشە زیت و وشیارە
هەر دار هەڵێنی سەگی دز دیارە

مامر قەڵە و بۆ یان لەڕ و لاواز
ئە پچری هەتا دەکا هێلکەی قاز

قەل ئەلێن لاسای کەوی کردەوە
ڕۆینەکەی خۆشی لە بیر بردەوە

بەرەم هەیە چۆن قاڵی تۆ ڕاخەم
بە نکاڵم لە بەمن چەکمەی تۆ ناخەم

خو بەزل زانین هی تازە کورە
گەوج و نەزانن لێیان ببورە

ئەم پەندە کۆنەم لێ بسەلمێنە
لە ماوەی ژینت دو کەس مەدوێنە

یەکێ بە سواری دێ را دەبورێ
یەک پوڵ دەژمێرێ لە دەریا ژووری

زاڵم بێ بە پرد مەڕۆ بەسەر ڕیا
قەت بە دەمی سەگ پیس نابێ دەریا

مەوعیزە لەلای پیاوی عەقڵ کەم
بەیتی بلەیە و شانامەی ڕۆستەم

ئاو بە ئاور دا کرا و کوتا بوو
ئەو شەرە هەر بۆ لێفەی مەلا بوو

قەت مەلێ بوومان بیژە هەمانە
نان ئەو نانەیە ئەمڕۆ لە خوانە

قەی ناکا لەکەر بشکەوی جارێ
شەرتە لە کورتان نەکەوی خوارێ

ئەو کەسە دۆستی گیانی گیانیتە
هاورێ ی نەبونی و لێ قەوما نیتە

کەسێ چروکە و مستی قوچاوە
شێر بە گوێ بگرێ سوک و بەدناوە

پێستی ئادەمی بە سەر کشاوە
بەرگی نامەردی لە بەر کراوە

هاکا لە داخا بومە دێوانە
هەر کردەی منە و بردەی شەیتانە

مانە مردنی خۆش بیرەوەری
ژانە ژیانی سەدەقە سەری

خوشە تەنافم بچێتە ملی
نەك بە خێوم کەن بە لارەملی

ناچێ بە هەڵە پیاوی وریا و ژیر
تورە نابی زوو هەڵناچێ وەك شیر

ناراسی هەتا نەبینێ بە چاو
ئەگەر کوتت حەق رادەوەستێ ئاو

کێ باسی خەڵکی کرد بە لاتەوە
بۆ ئەوان قسەی تۆش ئەباتەوە

ئەم پەندە راستە و جێگەی باوەرە
روزمان ئاور خۆش کەری شەرە

پرس و رات نە بۆ ئیشت لە پاشە
سەری بۆ دەلاك نەتاشی باشە

كاری سەر بە خۆ ناحەز دەنوێنی
بەردی لە خۆوە سەران دەشكێنی

دەڵێن هەر شتێك شێت بیخاتە بیر
دەر نایەتەوە بە سەد پیاوی ژیر

گێرە چۆن دەكرێ بە بزنی هەزار
گا جووتی دەوێ و پیاوی كۆنەكار

هێندێك شت نابێ زۆر بی پشكنی
تۆ كاڵەك خۆری یا بێستان رنی

چاكی بۆ هێنا بەخت و ئیقباڵی
تورتنی خۆش و ئاغای ناحاڵی

دڵی ناسووتێ بە ماڵی خاڵی
گوڵڵەی بایز ئاغا و شمق لە كەنداڵی

تا عاقڵێ بیری كردەوە لە كار
شێت كاری خۆی دی بژی هەزار جار

بێ ئیزنی خاوەن بەخشین حەرامە
پیاوەتی لە سەر ئاوی حەمامە

منەت لەم و لەو مەکێشە دەم چەوت
پووڵ بدەو مەلا دەرکە لە مزگەوت

هەڵە چاو پۆشی لێ دەکرێ بەلام
جارێك و دوو جار نەکو بەر دەوام

شتی تەماع کار لە کرین نایە
ئەسپێی بە ئەسپە کێچی بەگایە

خۆی لە بۆ راوچی دەکوژێ تاژی
تا کەرێ نەبێ عاقلێ نازی

ئەمەش پەندێکە روون و ئاشکرا
برا مەکوژە بۆ دەستە برا

کەروێشك هەڵدێ لە ترسی گیانی
تاجی بۆ سەولە دەك بە سندانی

بە توندوو تیژی کار نابێ مەیسەر
مار بە قسەی خۆش لە کون دێتە دەر

وتیان پشیلە گووت بە دەرمانە
دای پۆشی بە خۆڵ ئەمە بێ ویژدانە

نەم دیوە لە ئاش گەرمتر کاسە
مەگەر لە زێر یا هەبێ نیوکاسە

لــه زەوی بــۆت بــێ یــا لــه حــەوا وە
قــەت دەستــی کــەوەم مــەگیــرە دوا وە

نــه قڵــه لــه پیــاوی شیــریــن گوفت و لفــت
قــازی مــه راغــەش دەخــوا مــاڵــی مفــت

وایــان فــه رمــووە زانــایــانــی زوو
زۆر دره نگ هــه یــه بــاشتــره لــه زوو

کــێ گــورج و خیــرا تــه مــاحــی تیــر بوو
شــه یتــان پــه لــەی کــرد چــاوێکــی کوێر بوو

ئــه گــەر شــەر قــوونــی لــه دەرکــت نــاوە
بیکــه خــوا بــه تــو یــا بــه وی داوە

دەســت مــه پــاریــزە لــه ویشــك و لــه تەر
دەڵیــن هــەر یــه کــه شــەڕ و نیــوە شــەر

ریــزنــه بــارانــه یــا رەشــه بــایــه
هــەر عــومــری بــه فــر بــه بــای فه نایه

ئــه گــەر رەمــه زان یــا شــه شــه کــانه
تــازە بــه شــی مــن زەم و دوو نــانــه

وتیــان بــه وشتــر بــۆ چــی داماوی
مــژدە بــێ خــوا کــورێ پــێ داوی

وتی؛ کوڕ دیاره هێزی ئه‌ژنۆمه
به‌ڵام، باری خۆم هه‌ر له‌ سه‌ر خۆمه

گۆشتی رانی خۆت بکه‌ی به‌ که‌باب
گه‌لێ باشتره‌ له‌ منه‌تی قه‌ساب

به‌ قسه‌ی چه‌ور و شیرین زمانی
تۆ هه‌ڵ خه‌ڵه‌ تێی گه‌ج و نه‌زانی

هه‌ڵه‌ وله‌ بیر چون جار و بارێکه
ده‌لێن هه‌ر عه‌قڵه‌ی له‌ خه‌سارێکه

دوستت تا نه‌بێ وه‌ک خۆت دڵ به‌ کوڵ
بۆی هه‌ڵ مه‌رێژه‌ خێرا کیسه‌ی دڵ

تا ئه‌و نه‌سووتێ بۆ تۆ هه‌ناوی
هه‌ڵ مه‌ قرچێنه‌ جه‌رگت له‌ تاوی

هاورێ گه‌لێکیان وه‌ک ماری سڕن
رواڵه‌ت دۆست و له‌ بنه‌وه‌ بڕن

ئیمرۆ لی ده‌ده‌ن لافی دڵسۆزی
ده‌ بنه‌ دوژمنی باب کوشته‌ سۆزی

به‌ کاکه‌ کاکه‌ هات به‌ لامه‌وه‌
بو به‌ سوجه‌ مار دای وه‌ پامه‌وه‌؛

گوشتە زون دێنێ برینی خەنجەر
تەشەر زامی دڵ دەکا دیوەودەر

زانیت کە دوژمن لێی هەڵگرتی قین
زەهری دەرخوارد دە تێکەڵ بە هەنگوین

زۆر کوتن بابی نادا بە قسە
ئەو کەسەی کەسە حەرفێکی بەسە

وا بووە هەزار بە تاقە مەردێ
بەزیوە دەڵێن سەت قەل و بەردێ

بۆ بابت ئەگەر بە سود و کەڵکی
قەت جنێو مەدە بە بابی خەڵکی

ئەم ماندو بونە وئەم خۆ کوتانە
بەربەرکانی لەگەل ژیانە

ژینی کەم لەگەڵ مافی سەربەستی
خۆشە نەوەك زۆر بژی بە پەستی

چ بە ئاشکرا چ بە نهێنی
دەی درویەوە هەرچی دایچێنی

چاکە و بیاوەتی قەت ناچێ لەناو
ون نابێ ئەگەر بیخەیتە ناو ئاو

شوێنی مه‌که‌وه‌ به‌ هه‌وای پێشو
تولی ئه‌و تولی نه‌ماوه‌ هه‌ی هو

ئه‌و که‌سه‌ی نانی بۆ تۆ نه‌ده‌خوارد
ناتداتێ بچی بۆ لاوێچێك ئارد

له‌م ده‌وره‌ که‌مێ بیرکه‌وه‌ نامه‌
گێره‌ت له‌ هه‌ولێر ده‌گه‌رێ مامه‌

گه‌لێ به‌ نرخ و جوانه‌ ئه‌م په‌نده‌
بۆ ئه‌و که‌سانه‌ی لوتیان بڵنده‌

کێ به‌رزه‌ فڕه‌ و خۆ به‌ زل زانه‌
ڕۆژێك ئه‌ی هاڕێ ئاشی زه‌مانه‌

هه‌تا نوره‌یان ده‌گا له‌م ئاشه‌
تا وه‌بیر خۆیان بێننه‌وه‌ باشه‌

ئه‌مه‌ شتێکه‌ بۆ هه‌مو که‌س ڕون
به‌مه‌یلی ئه‌و بو گه‌ڕانی گه‌ردون

خه‌ڵکی ئێرانی کرد بوو به‌نده‌
ئه‌و دیوه‌زمه‌ی خو ناپه‌سه‌نده‌

ئاکامی چی بو چۆنی به‌سه‌ر هات
ڕش و ڕه‌هه‌نده‌ ده‌رچو له‌ وڵات

جۆی لە چوار قوڕنەی دونیا پێ تەنگە
مام سامیش دڵێ ناموێ نەنگە

بزانە باران توند دێ بەرەو خوار
خۆی پێ هەزارە بێ فیز و دەمار

دەکەوێتە دەم گیانداری بەحران
دەبێتە دوڕی قیمەتی و گران

شەونم لە سەر گوڵ دەدرەوشێتاوێ
بەرز ئەبێتەوە بە تینی تاوێ

فڕی سوار دەبێ کە چو بۆ حەوا
زوو لە ناو دەچێ و دەبێ بە هەوا

با بینەوە سەر پەندەکانی زوو
وایان فەرمووە سەردەمی پێشو

گورگێک بەسە بۆ قرانی کۆزێک
ئابڕوی هۆزی دەبا ڕەش بۆزێک

هەر قافڵەیەک پێشەنگی کەر بێ
بێ گومان دەبێ توشی زەرەر بێ

لە دەرکی کەست هێنابێ شەقە
دەرکت دەدرێتە بەر مست و لەقە

کەمر لە کوێ کەوتۆوڵاتی خزاوە
سەیری کە کوندە لە کوێ دڕاوە

گەورە بی خەرجی پێویستە گیانە
ریشت بوو ئەشێ هەڵگری شانە

دروشمی پیاوان دیارە بە ریشە
بەڵام پیاوەتی ریش نی یە ئیشە

گەلێک جار لە بن ریش و عەباوە
فێڵ و تەڵەکە و پیلان و داوە

لای گەوهەر فرۆش گەوهەر گرانە
قەدری زێر لە لای زێرینگەرانە

بۆ گفتی شیرین دڵم لە کوڵە
ئێژن قسەی خوش کوێستانی دڵە

ئەم قسەش گەلێ بە تام و بۆنە
دل ئاوێنەی دڵ فەرمودەی کۆنە

پیاوەتی خەڵکی بگرە بەرچاوت
دەنا بە سپڵە دەزرێ ناوت

کەردەم کەمیش بێ زۆری بزانە
زیاد دەکا نیعمەت بە هۆی شوکرانە

نه ئاسن به فو بۆت نه رم ده بێ
نه حه مام به ترپ قه ت گه رم ده بێ

به هێزی لاوان به ته جره به ی پیر
به تێکۆشان و خه باتی شێل گیر

به ته گبیر و رای پیاوی روناك بیر
گا جوتی هیوات دێته وه به ر نیر

راوێنی غیره ت به که مه ر داکه
نان هه تا نه ی جوی قوت نادرێ کاکه

له گه ڵ ده ستی گه ل ته کانی ده رێ
به ره ت له قوراو دێنیته ده رێ

وه ك ده ڵێن ماوه ی کورته ته نگانه ،
زوو به دوی دا دێ خۆشی و فه رعانه

زۆرم بیستووه شاگردی کۆڵی
هیچ فێر نه ده بو له به ر کلۆڵی

چون ماندو نه بو له ئیش نه وه ستا
ئێستا که بۆته باشترین وه ستا

هه ر تۆزی له سه ر خۆ بێ پشوما ن
له قۆره هه ڵوا ده خوین هه موما ن

ناسپاس نەبی لە ماوەی ژینت
لە لێك وەردەگری لە دونیا و دینت

تۆ چۆنی بۆ من منیش هەر وامە
دونیا دەستە واو یا دەستە وامە

بە ئیمرۆ و سبەی درۆ و تەفرەدان
قەولی هاوینم لێ مەخە زستان

بەد بەخت ئیشی ناریك و خوارە
مزگەوت دانێ قیبلەکەی لارە

چون بەختی رەشە ئیشکی گرانە
خوێنی کە کرەیە دوانی ژانە

لە شانان قورسە دیزەو دزیوە
دوعاش بۆ خەلکی بکا جنیوە

بەختەوەر چونکی بارەکەی بارە
ناحەزیش بدوێ شیرین و تارە

هەرچی ئەو بیکا پەسەندی عامە
لە نیو کۆمەڵدا بە ئیحتیرامە

گەرچی حەق لە دڵ گران و سەختە
بدەن لە تەختە حیزیش بەبەختە

دویَ خەڵکت تۆقان ئەورۆ بتۆقە
مەشهورە دونیا مەندۆق مەندۆقە

وێنەی تۆ رەحمت بە هیچ کەس نەکرد
خوا شوکور ئەورۆ بۆمان بویە پرد

دوێنی ملهوڕ و تۆسن بوی کە چی؟
ئیمرۆ سەر شۆر و کز و مل کەچی

چەکت بە نەفتم کڕی بۆ گیانم
هات نورە گورزم دەردت دەزانم

دوژمن هەر بۆیە کاری سەر دەگرێ
چون بە عارەبە کەروێشک دەگرێ

خوێنی شێرت کەم لە دەمار و رەگ
هەر فسۆسی وەک تاجی قوباد بەگ

لە وەختی راو دا نەبێ گوت نایە
چار چی بە خوێری پیشەی هەر وایە

شتی چاک دەبێ رەسەنی چاک بێ
لە ماینی قۆترِ ئەسپی تێ نابێ

تاجی رەش کوژیش باوەڕم وایە
لە دڵی فسۆس قەت بەدی نایە

ساتێ ناگرێ ئارام و قەرار
لە نێو کالاندا تیغی جەوهەر دار

بە دو کەس دەکرێ خراپە و چاکە
چەپڵە بە دەستێك لێ نادرێ کاکە

بێ دەرێ دو گەز جاوی دێتە خەو
زگ برسی پلاو دەبینێ وەك ئەو

ئەو بۆنەی مەستی کردی وەك شەراب
کەر داغ کردن بو نەك کزەی کەباب

لە بەر مەینەت و دەرد و نەخۆشی
ناچێتە گەروم قەت ئاوی خۆشی

وایان فەرمووە قەدیمی دڵپاك
سوار هەتا نەگلێ نابێتە سوار چاك

تا نەخۆش نەبی نەچیە حەکیم
نازانی قەدری ساغی و سەلیمی

تا نەهاتەگوێت شەقەی قەناسە
تێ نەگەیشتی دونیا چ باسە

وتم لا مەدە لە رێبازی حەق
تا نەتنا تەبەق بۆ نەتکوت سەدەق؟

کەی پاشی باران کەپەنك دابە ؟
نوشدار و لە پاش مەرگی سۆهرابە

پاش روت کردنەوە بێ خۆف و خەتەر
تەشتی زێر دانی لە سەر تەپڵی سەر

لە بەردیان پرسی بۆ چی وا رەقی؟
گوتی بەردم دی زۆر بە دڵ رەقی

شایی نەکراوە دەهۆڵ تەقەی دێ
بەن نەرێسراوە جۆلا شەقەی دێ

وتیان بە قرژاڵ بۆ چی بەدو سەر
دەرۆی وتی شۆخ لێی عەیبە مەگەر

شەرنەکەر پیشەی زوو دانیشتنە
بەردی زل بەڵگەی نەهاویشتنە

هێندێ کەس ئازاو رژدن لە شەڕێ
هەتاکو لێیان وەراست دەگەرێ

کاتێ شەرەکە گەرم بو تەواو
رێگای هەڵاتن دەگرنە بەرچاو

دوژمن خەریکە کوێرایی دایە
چاوی دوو سەری پێمان هەڵنایە

دیسان خیشی کرد وێنەی بەرازی
کەر ماندو و مردو خاوەن نارازی

نایەوی لە گەل ئێمە بسازی
نە دێتە پردێ نە دێتە بازی

مەروانە خانو دەرکو دەروازە
دایکان ببینە و کیژان بخوازە

بە توند و تۆڵی و گورجی مەنازە
بۆ کچان بەختی دایکان جیازە

پیێم را ناگیرێ ئەم ناز و بازە
ددان کە ئێشا عیلاجی گازە

نامەوێ بمرم لە بەر موحتاجی
گۆشتی کەروێشک و بۆفی تاجی

ناخۆم و هەرگیز نەی بینم یارەب
شیری وشتر و دیداری عارەب

بۆ سیرت بۆبێ لە دەم لیۆ ئاڵان
نەک گوڵ وەرگری لە دەست خوێن تاڵان

هەر لە عەرشەوە هەتاکو قورش
کەس هەیە بە دۆی خۆی بڵێ ترش؟

سەر لە بەر نامەرد دا مەنەوێنە
بۆ وڵات و گەل خوێنت بڕژێنە

بە زۆری بازوو بە هێزی شانان
خانی خانان بە یان تۆزی بانان

شوڵی شلك و تەر دادێتەوە زوو
دەی چەمێنیەوە چۆنی مەیلت بوو

کاتی وشك بو چۆنی دا دێنی
زۆری خەریك بی رەنگە بیشکێنی

نەمام کە تازە چەقابێ دیارە
بە هێزی کەسێك دەردی دوبارە

بەلام کە ریشەی داکوتا زەوی
بو بە دارێکی زل و مل قەوی

دەر نایەتەوە نەك بە شان و پیل
بە کەڵ و کۆتان تەنانەت بە فیل

ئەگەر برای پشت بو بە برازا
تازە دەرچو کار لە کار ترازا

دەستە چەورەکەت لە من هەڵمەسو
بوك لە گەڵ تۆمە گوێت لێ بێ خەسو

دایک تاریفی کچی خۆی بکا
دۆم بێتو کەڵاش لە بۆ خۆی بکا

عەتر دەبێ خۆی بۆن بدا کاکە
نەک عەتتار بڵێ زۆر عەتری چاکە

یاران مەمدەنە بەر تیری لۆمە
من نێر بێ و مێ بێ هەر لەبۆ دۆمە

سا بێ سکی خۆت مەدرە لە داخا
کێ مردو کێی تر ما لە وەجاخا

کمک دڵە کوێر بی عومرت نەمێنی
قاڵاو لە جێگەی بولبول دەخوێنی

لە دونیا هەرچی گەندە و مەندەیە
بۆ چی هەر بەشی خدری زیندەیە

لە جێگەی خۆی دا ئەمەش هەر پەندە
نامینێتەوە گەندە لە مەندە

زاڵ گوتی روستەم رۆڵەی زەمانە
قەت دوژمنی خۆت بە کەم مەزانە

مەڵێ با شارم ناکا ئەو گولە
چکۆڵە فێڵ و تەڵەکەی زلە

چاکە بە چاوا دراوە تورە
نەقڵی نێرگەکەو پیرە گاسورە

تەلا لە مل کەر بکەی ماقوڵە
سەلا لەو کەسەی بۆ پارە و پوڵە

ئەوی لە لێفەی بابی نەترپیوە
لوتی بەرز بو بەو زێر و زیوە

دیت سەگی سپی تغی لێ رۆکە
زەرەری زۆرە بۆ بارە لۆکە

چاکەی تۆم هەرگیز نابێ لە چاوا
نانی کۆماسی و پاسی جرتاوا

کەسێ خوی لە لا گەورە و گرانە
نەچێتە پێستی خەڵکەوە جوانە

کەسێ ئاکاری پەسەندو چا بێ
حورمەتی خەڵکی دەبێ لە لا بێ

عەیب و عاری خوی بێنێتە بەر چاو
خەڵکی بە سوك و چروك نەبا ناو

ئەگەر نەشخوێنێ کەڵەبابە سور
رۆژ دەبێتەوە بڵاو دەکا نور

کەسێ وەجاغ کوێر سەر بنێتەوە
بەکجاری چرای دەکوژێتەوە

کوڕی چاکی بۆ خێری بەلاشە
بێکەسی دەڵێن بۆ خودا باشە

ڕێز نادا بەکەر درێژی مەودا
نابێتە یەستر بەچونی بەغدا

سەرمایەی ژیان ژن و ددانە
بەدەردت نەخۆن دونیا زیندانە

خەتای نەکردوم بەمل ڕابێنی
شانەکەت لەسەر مندا دەشکێنی

مەشهورە دەڵێن خلە دەکا گا (!)..
بلەی چارە رەش دەبەن بۆ دیوان

یەکجاری لێز بو جێ بە هەتیوان
ماڵ بۆ خۆی نەبو ڕێی تێکرد میوان

ماڵی مێرولە بە کەچکە ئاوێ
وێرانە بێنەو بەرەی پێ ناوێ

زۆری ناشکوری کردو هەڵقرا
وا مانگا مردو ئیتر دۆ برا

ئاش هەر کار دەکا گەنم دادێنێ
چەقەنە سەری خۆی بۆ دەشکێنێ

مالی وا هەیە قاقڕ و کرێن
لێی دەس ناکەوێ بەردی سەرشکێن

چبکەم لە گەڵ تۆ بەختی خەواڵو
دەتکەمە تەنگە و دەبیتەوە پاڵو

تا کرژت دەکەم تۆ هەر خاوتری
هەر بۆیە ریسم بۆ تەوە خوری

هیوام کوڕێ بێ.. ئەویش لە بارچو
تازە کوڕاچی وەک بەفری پارچو

خۆت لێ ون نەبێ هۆشت نەتاسێ
پیاو دۆست و دوژمن دەبێ بناسێ

نە خوش باوەر بە نە بێ باوەڕ بە
نە تێ هەڵقوتێ نە کوێر و کەڕ بە

لای زیر و زانا هیچیان پەسند نین
گوێ بۆ بیستنە و چاویش بۆ بینین

هاتەوە بیرم پەندێکی زەریف
ئەم چاوە کوێر بێ نابینێ حەریف

هەرچی تازە بێ پەسندی خەڵکە
بەڵام هێندێ شت کۆن بێ بە کەڵکە

دۆست و دۆ لە گەڵ شەراب و توتن
هێندێکیش دەڵێن کۆن بێ باشە ژن

ئەمەش فەرمودەی قەدیمیەکانە
قەدری قەدیمیان زەریف بزانە

شەمە باشە بۆ هەمو کار و بار
بەڵام قەت بوکی تێدا مەکە سوار

شەمە و دوشەممە و سێ شەممە لیباس
مەبڕە زەرەرە بە تەجرەبەی خاس

ماڵ گەسك مەدە بە نوێژی شێوان
نەوەك ناکۆکی بخاتە نێوان

یا نوکی گەسك بدە لە ئاگر
تۆ لە پێشینیان نازانی چاتر

مریشك خوێندی سەری ببرە زوو
دەڵێن تێك دەدا بەینی ژن و شو

ئەگەر ناوەخت خوێندی کەڵەشێر
گۆشتەکەی دەخۆن یا دەی کەن بە خێر

کاتی خۆی نەبێ قاقا و پێکەنین
ئاکیامی دەبێ بە گریان و شین

هەر پێکەنینێک دوایەکەی شینە
شیوەن باشترە لەو پێکەنینە

دەرزی لە قاچ و قولی خۆت راکە
ئەو کاتە شوژن بە پێی من داکە

زستان بەسەر چو بەفر تووا وە
روو رەشی هەمو بۆ رەژی ماوە

ئەم پەندە سودی تا قیامەتە
زمان لێ گەرێ سەر سلامەتە

ئەم پەندە جوانەت لە بیر بمێنێ
تۆفان ددروێ کێ با دەچێنێ

هەمو کەس دەکا بەم پەندە بروا
هەچی با هێنای هەر بە با ئەروا

مەیهاوێ سەر من هەر چی خەتایە
دەستێک بە تەنیا تەقەی لێ نایە

کێ بێتو نەکا بەرگری لە خۆی
بەلام کەس خەتا ناگرێتە ئەستۆی

گەلێك تێك هەڵچون جۆی هومێد نینە
شەڕی کۆنە قین گەرم و بەتینە

خەیاڵ خەزێنەی بەکەس نەداوە
زێر بۆ دینەوە خەیال پەڵاوە

ئەمەش کەڵکی زۆر بۆ گوێدێرانە
کێ لە سەر سەبرە لە سەر خێرانە

کەری دێز دەکا حەز لە توپینێ
تاکو خاوەنی زەرەر ببینێ

بیری هەر لە لای هەل و هەڵمەتە
چوزانێ گورگ مەڕ بە قیمەتە ؟

قەسەم بەو کەسەی نەزاو نەمەرگە
توبەی بە راستی گورگ هەر مەرگە

تاکو بز شیر داو بەشی دا پیر دا
ئەو کلکە قوڵەی ریوی فەقیر دا

قیل سپی دەبێ بێ درۆی فەرزی
کلکی وشتریش دەگاتە عەرزی

تا گورگ دەکا توبە وەك نەسوح
سەبری ئەییوبی دەوێ و عومری نوح

ئەم نەقلە دڵی پیاو دەکاتە بەرد
قەل بە قەل دەڵێ روت رەش بێ نامەرد

ئەو کەسەی دەبو نەدوڕێ دوڕا
بۆ ئاسنی سارد دەکوتی لە خوڕا

نسیحەت ناچێ بە مێشکی کەردا
کێ دیویە بزمار بروا بە بەردا

حاملانی کەسێ خولقابێ ناحەز
هەر وەکو گویزە بیدەی لە گومبەز

بەو هەموو گیفە کوا دڵم خۆشە
پێشت پۆلا بێ پاشت کلۆشە

بەسمان بە سەردا لێدەگیزو فیز
پیوەدان خۆشە نەوەك ویزە ویز

لاوی کورد لەخۆی بەستێ فیشەکدان
شای ئێران قبوڵ ناکا بەسەپان

دەڵێن ناباری لە هەموو هەوران
دلنیاش مەبە لە سوری دەوران

ئەمش نەقلێکی لە مێژو کۆنە
پاداران بگرە بێ پا ئی خۆنە

ئەوەی تۆ قینت لێ بو خرا گوڵ
دمجا چنگێ رۆن هەلسو لە سەر دڵ

لە ترس و خۆفی ماری بەد کردار
لە پەنا ئاور خوم داوە حاشار

خوشیم نەدیوە لەم رۆژگارە
وەتی هەم ئیسال خوزگەم بەپارە

دەستی تەماحت هێندە پان مەکە
خاوەنی کەرەم پەشیمان مەکە

ئەم نەقلەیان زوو کرد بو شعار
بە قونی موفلیس ریشی تماحکار

کچ شو کا دایک دەماخی سازە
کوریش ژن بێنێ کز و بێوازە

خەڵک لە دەست تۆ دەمێکە یاسە
قڵب ئەبێتەوە کە پڕ بو کاسە

پێم سەیرە تۆ زۆر بە خۆت دەنازی
نە سەری سیری نە قونجکی پیازی

نە هێندە تاڵ بە تف بتخاتە دەر
نەوا شیرن بە قوتت دەن یەکەر

زۆر کوتن چی یە ریس و گوریسە
تا بەکێک دەڵێی دوان ببیسە

پیاو ماڵی دەوێ ژنان زێر و زێو
بزن خەمی گیان قەساب خەمی پیو

ئەوەی لێی دەدا لافی قەسەری
کونی مشکی لێ بۆتە قەیسەری

هەر لە کۆنەوە وا هات و واچو
گوڵ چن دڕویان بە دەستی داچو

کێ کۆی کردەوە بە زەحمەت و رەنج
کێ بەختەوەر بو بە گەنجی بێ رەنج

شۆرشی کاوە بۆ فەرەیدون بو
کاری خاتون و ناوی مەیمون بو

کوێخای لێ کەوتو مێی دەرەبەگە
گورگ کە پیر بو مەخەرەی سەگە

ژوشک بە فەرخەی خۆی دەڵێ رۆڵە
بێچوی کێ بە قەمت تۆ نەرم و نۆڵە

لە بەر دڵی من نە قاقوم نە قو
نەرم و شل نینە بە سەمت یەکی تو

لای باوەر نەکەر خۆت ماندو مەکە
تەقەی بۆ بێنە لە بنی کولەکە

ئەگەر نات خوری تۆ بنی رانی
چیتە لە ماندو نەبینی شوانی

زن ئەگەر ناوی سوکی دواخستی
خیرا سێ بەردەی ینێ لە مستی

پیاو ئەگەر هاوری نەبوو هاوبیری
دەلێن سێ بەردە و مالی فەقیری

عەیبی یەك کوتن لە عەقل دووره
دیارە وەك تفی سەر بەرە و ژوورە

لە چاوی خۆتا نابینی گاسن
شوژن دەبینی لە نێو چاوی من

دەزانی ئەوی بە بیر و زیرە
خەتی خوار لە بن سەری گای پیرە

خوای تەعالا کار بێ جێ ناکا
تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا

کەسێ لە مەیدان گۆ دەباتەوە
کاتی رق هەستان قین بخواتەوە

پیاوەتی و ئیشی مەردانە کردن
لە بەخشین دایە نەك تۆڵە سەندن

چۆن بە دەرد دەخوا چارەی دەردی کە
شیف و وەردی کە لە سەر بەردی کە

کەچەل دەرمان کەر بوایە بۆ کومان
لە پێشا سەری خۆی دەکرد دەرمان

ئەگەر لێ گەڕێ شوفاری بەدفەر
ئاو دەخواتەوە گورك لە گەڵ مەر

کەنگێ درۆزن جێگەی بڕوایە
تەنانەت ئەڵێن دوژمنی خوایە

درۆزن شتی لە بیر نامێنی
حافیزەی کەمە زوو دا دەمێنی

وتیان بە ڕێوی شاهیدت کێ یە
وتی: کلکی خۆم باوەرم پێ یە

بەیتی رۆستەمیان سەر لە بەر شەوێ
خوێندەوە یەکێ هاتە جواب لەوێ

کاکە گیان مەڵێن قسەت بێ جێ بو
نەمزانی روستەم نێر بو یا مێ بو

ئەڵێن حاڵی بون لە نان و پلاو
تامی خوشترە بە بێ چاوو راو

دەعبای وا هەیە دەخوی گوشتەکەی
دەعباشە دمبێ گوشتی دەرخواردەی

پێم خۆشە لاشەم لە دوم بکێشم
بەڵام منەتی ناکەس نەکێشم

هەر بە منداڵی شێرە کور دیارە
لاوێج نمونەی بار و خەڵوارە

ئەوی قەرزی کرد بە تەمای داهات
هیوای پێ نەبێ تایەکی داهات

هەوڵ جێگای رەب وەبەر چاو بێنە
بە دلنیایی رەب بچە قێنە

چکۆلەترین کردەوەی عیسان
لە سەت قسەی زل باشترە دیسان

ئەستەمێك نی یە کە ئاسان نەبێ
پیاو ئەو پیاوە یە هەراسان نەبێ

بیستومە دەڵێن مار هەتاکو مار
نەخوا نابێتە هەژدیهای زۆر دار

حەزدەکەی نەچیە ژێر زنجیر و کۆت
دامەزرێ لە سەر پەت و سینگی خۆت

کێ رازی نەبێ بە بەخت و بەشی
تەمەن نەردە با بە چارە رەشی

ژن دەڵێ نانی ویشکم دەست کەوێ
خوشە نەك پڵاو لە پەنای هەوێ

پاشایەتی بە ماڵی بە تەنێ
کیتەڵەی تەنێ بەهەشتی بەنێ

قازانی میردان بە حەوت ساڵ جارێ
دێتە کوڵ بەڵام دەرژێ بە جارێ

شتەی هەمانە و داسی رەمانە
زۆر باوە لە ناو دۆستی زەمانە

بۆیە جارز بوم من لەم زیانە
رێوی لە حاستم شێری ژیانە

خراپت بۆ خۆت دا نەنا کاکە
خوداش و خورماش تەگبیری چاکە

ئازا کوڵی دڵ دەرێژی بەقین
بێ دەسەڵاتیش بە گریان و شین

بەینێکە بڕوات بە کەس نەماوە
نیٚرە بیدۆشە لە تۆ روی داوە

ناندێن کون مەکە لیٚت خوارد بۆ نان
چیٚژمت لە خوێ کرد مەشکێنە خوێدان

هەرچی نەبوبێ نەیان فەرمووە
بیری دواییت بۆ ئەوی چو چووە

وریا بە نامە تا نەختێ زووە
تا زۆلە چەرم ئاو نەی بردووە

من لە خەلکم بیست تۆش ببیسە لیٚم
جام دەلێ بشکیٚم بەلام نەزرینگیٚم

لە دوی ویٚل مەبە تازە بۆ سودە
باز لە بەرەگە دەرچو بیٚهودە

قسە بێکەلکە دریٚژ و زۆر بێ
کەم و دلگر بێ نە زۆر بێ و بۆر بێ

زەرەر لە نیوەی بگەرێتەوە
زوتر قەرە بوی بۆ دەکرێتەوە

دەرفەتە هەرچی دەست بەجێ کریا
خوزگە بەو خوێنە شەو دێ بە سەریا

برین تا گەرمە گورج و بێ ترسە
کە ساردەوە بو بە ژان و قورسە

سوتاوی لە سوێی خاڵی گەردەنی
هێندو تامەزرۆی بە دۆش دەژەنی

روبینی و ریا بۆ بەر حزورە
چاو حەیا لە چاو دەکا مەشهورە

سەولە زیاد نابێ بە کلکبە سوتە
ولامی دەدرێ بە توتە توتە

خاڵەگیان بۆیە پێت دەڵێم خاڵە
چولەکە بگری بۆ ئەو منداڵە

نابوتی دەستی پەڵپ و بیانوم
لە حاجی عەلی ناوم کە بانوم

تاسەم لێت نەشکا ناردی بە دوتا
بۆ نانی بەسەر سێڵەوە سوتا ؟

هاوین چو درا لێفەی فەقیری
چەن تاڵە ژینی فەقیری و پیری

ژن تۆ سنیش بن لە فەقیریانە
تۆران و زیز بون شیر و تیریانە

پیاو چەقویە ژن بۆتە هەسانی
توند و تیژ یەکا بە هۆی زمانی

رق هەیە چەن مال ئاوەدان دەکا
رقی واش هەیە ماڵ ویران دەکا

هێندی بە تا خوین دەبزوێ لە رەگ
قەدیمی دەڵێن شەر هاتۆ بۆ سەگ

شەڕ ئیرادە بەو سەر و سمێڵەوە
تۆشیش بوی رێگای ئاشتی بێڵەوە

زۆر دەرهەڵمە بە هۆش بە تارێنە
چاوت سور نەبێ کەف مەچارێنە

کاکی خۆم دونیا زۆری پێ دەوێ
رۆژێکی وادێ چاو وە چاو کەوێ

وەك دەلێن هەر کێو وەکێو ناکەوێ
ئادەمی حەوجەی وە یەکتر ئەوێ

مەشهورە بزن بۆ تاقە شەوێ
جێگای خۆش دەکا لە کوێ وەرکەوێ

بە پیری نەبڕ بێ خواردنی پلاو
لە باتی زاری دەست دەبەی بۆ چاو

دەڵێن ئادەمی تەیری بێ باڵە
لە چۆڵ و چیا وێڵ و عەبداڵە

گا لە پێ دەشتە گا لە دەم یاڵە
ڕۆژێ دوور وڵات ڕۆژێ لە ماڵە

دوو شت هەن باشن هەم هۆی نەمانن
ئاگر و ئاون وا بێ ئامانن

کەمێ تاوس و تووتی خۆش دەوێ
ڕێی هیندوستانی دەبێ بەر کەوێ

کێ شۆری کەعبە لە سەری دابێ
دەربەستی چەقڵی موغیلان نابێ

باب دەسپەڵاتی دا بە عەولادی
دەبێ بچێژێ دەردی بێ مرادی

کێ لە زۆر زانی بابای عەیارە
نێو بانگی لە گشت دێهات و شارە

کێ بە قەت هەمو کەس نین ئەستورە
کێ لە خوێن ڕشتن ئازا و جەسورە

کێ ڕۆژی دەعوا مەردی مەیدانە
سوار چاک و ڕەشید شێری دەورانە

کۆ ترس و باکی نی یه له دوژمن
پێی بانادرێ هه رگیز بەشی ژن

پیشت دریژ مه که زیاد له ئه ندازه
سه ره رو مه به ئیزن بخوازه

به که ڵه زه ری بۆت ناچێته سه ر
دنیا به پوشی نه گیراوه سه ر

له چاو نه زیری واز بێنی چاکه
به و گه زو ریه ت ناوه نێ کاکه

دوعات ئه وه بێ شیرین تاڵ نه بێ
قه ت نا ته بابیت له نیێو ماڵ نه بێ

ژن به پیاوی کوت تۆ هیچ مه که ره
ئیتر ده بێته چه په ره شه ڕه

بێ وه فا زۆرن له ژن و پیاوا
چاکه و پیاوه تی ده ده ن به ئاوا

بێ به قاو سپڵه من هه روك پشیلا ن
سێبه ریان عه ینی تودرك و شیلان

بێ هه نار و به ی که ی دێنێته به ر؟
شه خته نابێته شنه بای سه حه ر

ماریٚك بەخێو کەی بە قەند و شیری
خزمەتی بکەی تا کاتی پیری

چاکە لە گەڵ ئەو بکەی بەردەوام
بەدەوری دا بێی وەك بەندەو غولام

رۆژیٚك لە قاچ و قولت دەهاڵێ
پرزەت لێ دەبڕێ دەتخاتە چاڵێ

وایە ئاکامی دۆستایەتی مار
بە وتەی مەشهور شەرعی مار بەدار

شیٚر دەڵیٚن ئاخوا جێ دەمی ریٚوی
ئەگەر لە برسان بمرێ لە کیٚوی

هەڵو ناچێتە هیٚلانەی قالاو
گەر هەڵپروکێ لە بەر سوورەتاو

ماڵ چونکی هەرا و هوریای کەم بووە
دەر دەڵێی ئاشەو ئاوی کەوتووە

دەلیٚن مامەگیان گونت بە چەندە
دەڵێ بە سەنگ و تەرازو بەندە

گەر بۆ تۆ هەبێ لەچك بەسەرێ
بۆ منیش دەبێ کڵاو لەسەرێ

چون قوڵە فیتنە ئاوری بن کایە
ناکۆکی وا زوو کۆتایی نایە

دەڵێن سەگێک چو ئاشی لستەوە
یەکێکی تر چو پاشی لستەوە

تەت پیاوی توڕە نەدوێنی چاکە
بەڕو لە دەمیا تەقیوە کاکە

ئەوی لە هیچ کوێ بۆت زەوت نابێ
رەنگە ئاڵەتی لە تنگ کرابێ

هێند بە پەلەیە بوکی رازاوە
هەر دەلێی ئەسپی بۆ زین کراوە

چون توشی خەم و مەینەت و داخ نی
عیسا گرتوتی و موسا تۆی ئاخنی

چاو چنۆک ئاوا قولمان لێ هەڵکا
خوزگە بە کفن دزی هەوەڵ کا

هەر لە خۆم نەدەن بدەن لە هاورێ
پیسم لە جەواڵی کاو گزرە دەدرێ

هاوسێ ماڵێکمان هەبو بێ منال
لە کوچە و کۆلان کە دەیدی منال

وا لە باوەشی خۆی دەگرت هەتیو
دەتکوت بوویەتی بە دوو نۆکڵ و نیو

خەمی براکەم پشتی کردم کۆم
بێ سەر و شوێن چو وەك بەردی بن گۆم

گەمیەت غەرق بو وا دز داماوی
یا پیرێژنی دۆڵی رژاوی

رەش کوژە ئەوی تۆ پێت فسۆسە
بو لیت کردومە راوی سی کوسە

ویستم لە گەڵ تۆ نیێوم نەزڕی
تازە پاش تڕێ با خەمشەی دڕێ

کابە کەج نابێ ئیمان نابێ کز
جار و بار بکەن قەیەك بۆ دز

خانو یەکێکە کە بانو نۆیە
بۆیە تۆز و خۆڵ هەتا ئەژنۆیە

هەرکەسێ زانا وئەهلی نەزەر بێ
پێی سەیرە بێستان بێ سەرە خەر بێ

ئەم پەندە جوانەش بە گوێ بسپێرە
سەگ و مزگەوت؟ وشتر و گێرە؟

سەگ شاڵاو بێنی و ئازار بدا لەش
هیچ فەرقی نی یە سپی بێ یا رەش

ساواک و سەیت بۆ حاڵی میللەت
تەرسە تولێکن کراونە دوو لەت

هەر یەکەی بۆ خیو بارە بەرێکن
یانی دوو جاشن لە ما کەرێکن

ئەو کەمەی پیرە و ژنی نەختێ جوان
لە کار و کاسپی ستە بێگومان

هەر تاو نە تاوێ دەرواو دێتەوە
ماڵ کاول دەلێی جاو دەنێتەوە

ماڵ هەیە زۆر بە نازو بازە
لەگەڵ ئەوشدا کز و لاوازە

چاو بە قولاّ چوو رومەت قوپیوە
دەڵێی جندۆکە پێی دا تپیوە

هەیشە گۆشتن و خشپیلانەیە
هەر دەڵێی گوریەی گیپە خانەیە

سەر تەکان بدەی لە جوابی سڵاو
دۆشاو بە گونت لە جێگەی بێ ئاو

دار هەر دو سەری پیسە داماوی
جاوەی لە قونێ وەی لە دۆشاوی

بۆ مەرگی ئازیز بەروک دادڕە
بەڵام چادەبێ گوڵ مەیل بڕە

چا.جوتن ئەو دو ئێسک گرانە
ئەو دۆیە باشە بۆ ئەو دۆدانە

خوا کارەکانی سەر سور هێنەرە
تەختە تاش نی بە تەختە رێک خەرە

یەکی کەس ناخا لەم دنیا پانە
بۆ داعبای کوێرێش دەکا هێلانە

تا لیت داوەخا دەرکێک بە حیکمەت
بۆت دەکاتەوە چەند دەرکی رەحمەت

سەگ تاجی گرتی تۆی هەڵسو نەجیس
قەدیمی دەڵێن پیس دەچێ بە پیس

حەیفە پیاو شتی چاک بدا لە کیس
پیس کر دەگەرێ لە شوێن شتی پیس

مەشهورە زستان روژێکی ما بێ
کاری خۆی دەکا ماڵی خرا بێ

ئەگەر هەڵی کرد سۆزەی زریانی
نە چۆڵ دەپرسێ نە ئاوەدانی

واتە کچ کاتێ مەیلی بو لە شوو
ناپرسێ تەرمە هەنگوینە یان گوو

شوڵێک بە تەنیا تۆ دەی شکێنی
دو وسیش بن رەنگە زەدەی پی بینی

بەڵام کە بو بە حەوت و هەشت و نۆ
ناشکێ بە حەوتی وەکو من و تۆ

وتەی پێشینیان بە دڵ بسپێرە
سەفەری زستان خۆی لێ ببوێرە

نەکرا ببوری تۆ لەو سەفەرە
هاورێی شارەزا لە گەل خۆت بەرە

سبەی رێگەوە هەتا نیوەرۆ
لە کوێ مایەوە دەرت کەن مەرۆ

زستان روخۆش بو بێی هەڵمەخوێنە
سەر وەشێن نەبێ کلک وەشێنە

ئەگەر درۆ بێ بە ئەستۆم وەبال
هەر چی لە مشکە دەدرێ جەوال

هەر چی بوگەن کا عیلاجی خوێیە
خوێ بوگەن بکا پەنا بۆ کوێیە؟

ناشکوری نەبێ گوریس بە یەك لا
ناگا نەخوازا بیکەی بە دوو لا

چون کۆشکی هیوات بناغەی بۆشە
پێشت پۆلا بێ پاشت کلۆشە

سەرت بگاتە تەختی پاشایی
ژێرت مەفرەقە بێ نرخ و بایی

مەروانە خاڵەن تۆشە و قرانی
لە سەر دڵان بی لە بەر دڵانی

هەر چەن بە بیرو و زیر و چا ناسی
تا لێت نەقەومی خەڵکی نناسی

ئەم پەندە باوە لە دێهات و شار
دنیا یا زۆردار دەیخوا یا بێعار

هاتەوە بیرم پەندێکی ساکار
قسە کەوتە زار دەکەوێتە شار

خواوەند لە چارەی کوردی وا نوسی
سەردانێ لە سەر کوردە ناموسی

بە کەم قایل بە تا زۆرت دەبێ
هەشت بێ لە مشت بێ نەک نۆ بێ نەبێ

دیارە ئەوانەی تەسەل و تێرن
گوێز لە هەمبانەی خۆیان دەبژێرن

کوا تازە پێک دێ وەسڵی ئەو یارە
ئاخری عومرە و ئەوڵی کارە

هەر سینفێ لە گەڵ سینفی خۆی کۆکە
دیارە هاواڵی گولان خدرۆکە

هەر وەک سیر و مار رێک ناکەون باش
کەتگەر و قوماش نابن بە پۆڵداش

وەک شای بێ جوقەی لە سەر تەختی خۆت
ئەگەر هەڵنەدەی شەق لە بەختی خۆت

دەستت نە لەرزێ بەختی کە بارەت
دۆشاو کە زۆر بوو پێی دەگرن تارەت

خوری خۆی دەدا بە نیوە رێسی
هی خەڵکی دێنی بە تەشی رێسی

چاو لە چاو شەرم دەکا وست لە مست
دەگەڕێتەوە بە بێ هەست و خوست

کابرایەك ڕێیان نەدا لەو دێیە
دەی پرسی ماڵی کوێخا لە کوێیە

ئەو شوڕە لاوەی شێر دەتەزێنێ؟
لە داوی عیشقا مو ناپسێنی

زەرد هەڵگەڕاوە لە تاو کەنیشکێ
نە دەزوە بپسێ نە دەرزیە بشکێ؟

شاعیر کە زانی قافیە تەنگە
دیتەوە بیری هەرچی جەفەنگە

کۆزی کارەگەل ببینە ئەو جار
قەپوچگێك داگرە لە ماستی توێدار

کەم دەکا نرخی قاڵی کەمێ دەڵب
هەر بۆ خاوەنی باشە ماڵی قەڵب

هەو هەموی سواران هیچیان پێ نەکرا
بە شڵپە شڵپی پیرێژن چ کرا؟

بە دەردێکەوە ئەمساڵ دوچارم
ڕۆژی لە دارم ڕوژێ لە خوارم

ژینی بێ خەتەر پاشایەتی‌یە
سەروەت لەش ساغی و هێمنایەتی‌یە

ئەمەش فەرمودەی فەخری عالەمە
مەزنترینی نەسلی ئادەمە

فەقیر کە دیار بێ کەسی یار نی‌یە
کەس لێی ناپرسێ کاتێ دیارنی‌یە

لە حاست پیاوەتی بەندە و غولام
چاکەت بۆم نەبێ بەرزە مقام

دوژمنی دوژمن بە دۆست بزانە
دۆستی دوژمنت بۆ تی هەلدانە

کێ بۆ خۆی بژی لە عەقل زویرە
ئەو کەسە ژیرە خەڵکی لە بیرە

کێ دل ئاوایە و هیمەت بڵندە
ماڵیشی کەم بێ زۆر دەوڵەمەندە

کەسێ لە خێرو چاکە بێزارە
شای مەملەکەت بێ روت و نەدارە

پشتت نینۆکی خۆت نەی خورێنێ
سەت نینۆکی تر خروی نامرێنێ

حەسود حەز دەکا هەتا بمێنی
نینۆکێلت نەبێ سەرت بخورێنی

کەوتونە گەمەو گز و فت لێمان
ئاسکی نەگیراو دەبەخشن پیمان

ئاسکی نەگیراو چەندە ئەوەندە
خورما لە بەغدا زۆر و زەوەندە

بە پێڵاو بدە لە تەوقی سەرمان
حاشا لە وەعدەی دوری سەر خەرمان

قەرز کوێر ئەگەر گوشت بۆ باوێ
هەڵیگرەوە و برۆ کێشەی پێ ناوێ

قەرز کۆن دەبێ نافەوتێ بەڵام
یەخەی قەرزدار مەگرە بەردەوام

قەرز کۆن کردن هۆی نەدارییە
دەست تەنگی مایەی شەرمەزارییە

کێ قەرزی خەڵکی نەدا بە ئانقەست
دەمتی ئومیدی بە یەکجاری بەست

بەڵا لەو کەسەی قەرزی دوا خرا
دەرکی متمانەی لە سەر داخرا

بە سیانە جارێك بویان رێك كەوێ
بۆ زشتان شەوێ بۆ پیران تەوێ

گەلێ كەس كوشتەی یاری دڵخوازن
كچان بە مەیلی خۆیان دەخوازن

پێشینە دەڵێن بە خۆ مەنازن
ئەوی دڵخوازن هەر مارانگازن

هەن بە رواڵەت شلوخ و لەبارن
بەڵام دور كوژی نزیك خەسارن

هێندە بە فیز و تیزە ئەو لاوە
هەر دەڵێی دۆمە و خەڵات كراوە

زیاد لە ئەندازە خۆ مەپارێزە
نەخۆشە هەر كەس بە قێز و بێزە

كی لە كەسب وكار بە بێز و بنۆێنە
بەرێ وەبالی وە ئەستۆی خۆیە

ئێژن تەوەزەل چەشنی دوڵپایتە
قورسایی زینی لە مل خەڵكایە

وەك قیلی كەوای سپی بێ وایە
یا خەرەنگەزی بن كلكی گایە

کەسیک شعوری لە چاوی دابێ
ئەزانە با لە سەت ئاوی دابێ

گوێ بگرە پەندی هەمو کەس بیستو
رامە پەرێنە قەت سەگی نوستو

کاکە زۆر بۆ لای خۆتی مەتاشە
نەشیش بوتێ نەکە باب باشە

بێ تامە گەلێ شتی سپی و سۆڵ
هەر لە دور خۆشە ئاوازی دەهۆڵ

قەی ئەو کەسە دیارە ناچەسپێ
لە گیرفانی دا هەڵپەرێ ئەسپێ

ئەم بەندەم گەلێ لە لا عەزیزە
خوزگە بەو باغە ورچی لێ زیڕە

پێت خۆشە عەیبت قەت دەرنەکەوێ
عەیبی کەس مەڵێ تۆ لێر و لەوێ

هەر سینقەی لە گەڵ سینقی خۆی کۆڵە
دیارە هاواڵی گولان خدرۆکە

بۆیە خاوەن کار هەر دەڵێ زووکە
پێیەرە بە دەست ناعەلاوە سوکە

زانا ئەشێ هەر بۆی بدرکێنی
کەریش نە تیزەی تێ بوەژێنی

لە رەسەنی چاک دەبێ شتی چاک
لە ماینی حدود یەکسمی چالاک

قۆزی بی زەوات قاوە قاوێتی
ترخێنەی بۆ تام شەو پڵاوێتی

ئەوی لە کوڵان بۆرە بۆریەتی
زگی لە برسان قۆرە قۆریەتی

لە کن ئاسینگەر کەسێ دانیشێ
بەرگی دەسوتێ یا سەری دێشێ

لە سەری مەرۆ حەیات با نەبەم
با لێفە لە سەر هەتیو لا نەبەم

کێ پەسند ناکا قەی وا بەجێ
دەست ئەگەر شکا خوار دێتەوە جێ

کەس پەنا نابا بو سێبەری کوند
ئەگەر جێی نەبێ لە شار و لە گوند

دوو روو قەیان بۆ ئیعتیبارە
وەک نیسک نە بەر نە پشتی دیارە

لە دەستی کەرەم مەگرە بەهانە
کەمی هێندێ کەس بە زۆر بزانە

ئەگەر لا لوت بێ لە کەرەمی کەم
بێ شک دەکەویە بەر لۆمەولەقەم

مەشهورە هەر کەس بە کەم نەزانێ
پیاوەتی زۆریش بە کەم دەزانێ

دوعای پیاوانی ژیر و بە هەستە
ئەم دەستە موحتاج نەبێ بەو دەستە

بێ هێزی هەوی رۆن نە باتی یە
کەم خواردن لە کەم دەسهەلاتی یە

ئای خوزگە شوفار لاڵ و کەر بوایە
ئاو خواردنەوی گورگ لە گەل مەر بوایە

لە زانایەکیان پرسی وە پێشو
زیندو لە دونیا زۆرە یا مردو

جوابی داون ئەو شیرن و تارە
مردو لە زیندو زۆرترە دیارە

چون بێچگە لەوەی تا ئێستە مردون
ئەوانەی مردوی زینشن ، مردون

ئەو کاتە ماڵبت کرا بە پێ خوست
گەورە ئاوی رشت چوکە پێی رێخست

بۆ زۆر بو ئەوی خۆی لە پێناو نا
هی شاخی هات وەی باغی راو نا

کەس بو بە ناکەس ناکەس بو بەکەس
قەدیم وەجاخان دەرچون بە عەبەس

چرای مەزلومان دایم بێ نورە
ئاوی زاڵمان سەر بەرە و ژورە

دایک کە بو بە باوەژن دیارە
باوکیش هەر ئەبی بە باوە پیارە

چکۆلەتری کردەوەی عیسان
لە سەت قسەی زل باشترە دیسان

کەسێ بە زۆر و بە کەشەکەشی
عیلاقەی بکەن پیس نابێ لەشی

کێ عیشقی گەلی بە دل دا ناچێ
ئاوی ئامۆن و تونی با باچێ

کەسێ دایکی خۆی نەدا بە خەتەر
بە دایکی خەڵکی چۆن نابا زەفەر

دەڵێن پاییزی سەر وەشێن چاکە
گوایە زستانی خۆش دەبێ کاکە

سەفەر و سەودا دوو بەڵگەی چاکن
تاقی کەرەوەی پاک و ناپاکن

کێ گوێلکی خەڵکی بۆلای خۆی بێنێ
هەر گوێل هەوساری بە دەست دەمێنێ

لە هەوراز ولێژ قەت مەڵێ کوتن
لە بەر با هەرگیز مەکێشە توتن

زاوا بەندی هەتا کو مردن
نەکەی بچێ سەر ماڵی بابی ژن

زستان بیەوێ خەڵکی بکا قڕ
بە شەو سایەقەو بە ڕۆژ هەوری پڕ

پیاو منداڵی خۆی کەم ڕوی بداتێ
نەوەک بۆ ئەوان هەڵنەکا ساتێ

تۆڵەیان لە بیر ناچێ دوو دڵ پڕ
نە مار کلکی خۆی نە باغەوان کوڕ

بنی هەمبانە کونی تیدا بێ
بە جەواڵ تۆی کە هێشتا پڕ نابێ

ئەلێن هەر ژنێ مێرد بیکا سەنگین
عالەم هەڵتی پێی نابێ نەنگین

بەلام هەر ژنێ مێرد بیکا ترۆ
بە هەمو عالەم ناکرێ پەرۆ

پیاو ئەگەر شێرە یا خو پڵنگە
ژن دەرکی نەکا کەمتر لە پنگە

ژنی وا هەیە پیاو دەکا بە پەند
هەر ژنیشە پیاو دەکا سەر بڵەند

پەندی پێشینیان خۆراکی گیانە
موسیقای دڵە باغچەی ژیانە

پەندی پیشینیان یادگاری یە
میراتی کۆنی کوردەواری یە

پەندی پیشینیان گەلێ پیرۆزە
مایەی شانازی بۆ گەل و هۆزە

پەندی پێشینیان بەڵگەی خەباتە
دیاردەی مێژو و گەل و وڵاتە

بە پەردی دوژمن لێت بێتەوە پۆست
نایەشێ بە قەت گوڵی دەستی دۆست

ئەگەر باری کەر تفەنگ بێ پاکی
گورگ تووشی بێ وەی خوا بە چاکی

وەهای فەرمووە ڕەسوڵی ئەکرەم
سڵاوی خوای لێ بێ هەمو دەم

مرۆ پیر دەبێ هێزی نامێنێ
دوو خسڵەتی ئەو جحێڵ دەمێنێ
یەکێ تەماحی بێ حەد و سنوور
یەکێ ئارەزوی زۆر درێژ و دوور

چاوت نابەستم خۆی بەر حزورە
گۆشتی سەر چەپەر وتەی مەشهورە
وا نەخۆشێکمان کەوتۆ لە ماڵێ
بە شەو دەناڵێ بە ڕۆژ دەماڵێ

هۆشی تاساوە لە تاو مشتەری
ئاگری بەری داویە لە سەری
خۆ بە زل زانین هی تازە کورە
گەوج و نەزانن لێیان ببورە

لە ناو ئافرەتان ئەم پەندە باوە
لە گەلێ شوێن و جێگا وتراوە
ژن دەڵێن مەچۆ بن نیسێی بەردی
جێی هومێد نی یە وەك بەقای مێردی

ئاردی خۆم لێکرد کەپەکم دابێشت
گەلێکم تاڵی و سوێری دونیا چێژت

نەخەوتوم لە سەر ڕێگای ئەم و ئەو
تا خەونی ئاڵۆز ببینم بە شەو

زۆرم جەفا دی لە ڕێی دڵداری
بومە شوانەکەی حەق نادیاری

بۆیە کەسی خۆت پێت هەڵدەکالێ
ڕێوی دەرەوەی شێری لە ماڵێ

هەر ژنێ بە دەم پیاوا هەڵشاخی
ماڵی بۆ چۆڵ کەو ڕاکە بۆ شاخی

بە قسەی ئەم و ئەو کەس هەڵنەتیزێ
ئاش لە میستن بۆ ڕوژێک دەمیزێ

هەتاکو کەللەم دەدرون لە جاوی
لە بیرم ناچێ دەردی بێ چاوی

دەتوانم ئازار نەدەم دڵی کەس
چی بکەم لە حەسود لە خوشی تورەس

بە شان و قۆڵت ببیەی بۆ کابە
پێی زیارەت کەی هەموو ئەسحابە

بە کۆڵ بیگێڕی ئەو حەق نەناسە
هەر هەمان ئاشەو هەر هەمان کاسە

جوابی پرسیاری دوژمن نازانم
دیارە نازانم راحەتی گیانم

لەسالی ۴۴ تا ۱۲۵۶

لە ساڵی ٥٤ ئەم شیعرەی هونیوەتەوە

## جووتەمەم

ئەی جووتە مەمت عەینی هەڵووی تازە قەمریکە
فیداری دەمی تۆیە دڵم چارە سەری کە

گیان بۆتە پەپوولێک و لە دەوری شەمی رووتە
تا باڵ و پەری پاکی نە سووتاوە دەری کە

چاوت کە بە هاو کاری بڕۆت خەڵکی دەکوژی
ئەگریجە لە پای چی لە گەڵ ئەو جووتە شەریکە

دوژمن دەپەری تۆ بە تەڵا هەڵ خەڵە تێنێ
یا جوابی بە تێڵا بدە یا جارێ کەری کە

ئەم شاعیرە بۆ چاوە کە سەودا سەری تۆیە
تاوێ وەرە دەس باوێ ملی ، بەختەوەری کە

## کیژی سابڵاغی

ئەگەر ئەو کیژی سابڵاغی وەدەس بێنم بە یەکجاری
دەکەم مڵکی دڵ و دینم نیساری خونچەکەی زاری

لە پێناوی دەنیم عومری درێژ و گیانی شیرینم
مرادم بێت و حاسڵ کا لە دوو لێوی شەکەرباری

مژۆڵی چاوەکانی قاتڵی سەد لاوی بەدبەختە
هەزاران بۆ خەتا کەوتوونە داوی پرچی رەشماری

بە باڵا سەروی بووستانە بە روو شەمعی شەبوستانە
لە روخساری نمایانە جەلال و سەنعەتی باری

مضيء وجهها كالشمس فوق الطود اذ تطلع
منير كبدر الليل يجلو كل اقطار

هواها منذ حلت بالفؤاد كلها تجري
دموعي بالدم سالت كينبوع و انهار

بگفتم ای شه خوبان دو چشمم چشمهٔ خون شد
بگفتا پیش من سودی نبخشد گریه و زاری

چو بی مهری ازآن نامهربان دیدم یقینم شد
که در آیین خوبان نیست جز جور و ستمکاری

ئه‌مه‌نده‌ی زولفی وای گرتوم دڵ و هۆشی وه‌ها بردوم
ئه‌تم نابێ هه‌تا مردن له‌ به‌نده‌ی عیشقی رزگاری

ده‌بێ حافز له‌ زیندانی جه‌فادا هه‌ر بناڵێنی
له‌ گه‌ڵ نازپه‌روه‌ران بۆ خۆی ده‌کرد؟توشی گرفتاری

بو ماهی عالم ئیشگینده‌ اورائیم اوت کیمین یانر
اوزم رنگی مگر گومر اولمپ اولی کیمین ساری

دیم الله خاترنه‌ منی محنت ده‌ الدرمه‌
دیر هیچ فایده‌سی یوختی منم بانم بو سوز لاری

دووکانی من له‌ چه‌ند جوره‌ متاع و جنس تێدایه‌
به‌ڵام چبکم به‌ توورێکیش نیه‌ لم شاره‌ کریاری

پیرۆز بایی نەورۆزی ۵۳ی هەتاوی

## پیرۆز بایی

ئەم جێژنە پیرۆز بێ لە هەموو گوێگر و گوێدێر
پیرۆز بە دڵی خۆش و لەشی ساغ و زگی تێر

دوایین پەڕی هەڵدایەوە زستانی سڕ و سارد
پێچایەوە خوێن تاڵی دزێو ، نەگبەتی بێ خێر

موسایی بەهاری بە هەموو موعجیزەکانی
فێرعەونی دەی و بەهمەن و ئەسفەندی نیاژێر

نەورۆزە سەری ساڵە گوڕەی پیرە شەماڵە
بۆ گیانی هەرس دێ تلی پێ دا وەکو تاوێر

نەورۆزە بەهارە هەرەتی کۆشش و کارە
جا نۆرەتە ئەی کاکی فەلا مامەیی وەرزێر

خێرا کە لە خاو بێنە دەری جووتی کەڵانت
بۆ شێوی زەوی و زارەکە هەڵمەت بەرە وەک شێر

سەیری دەرو دەشتت کە دەڵێی باخی بەهەشتە
مێرگی هەموو بزوێنە هەوارگەی هەموو زنوێر

گیان بەخشە هەوای کێوو کەژو دیمەنی کوێستان
خەملاوە بە گیا خاوو گوڵی سوێسن و شلێر

هەر دەنگی مەلە تێکەڵی هاڕەی خڕو دۆڵە
هەر لوو زەوی بە فراوە دەکا هاژە لە هەلدێر

هەر تاوڵ و رەشماڵە بە داوێنی چیاوە
هەر رەش بەڵەك و داوەتی بێریانە بە بلوێر

زاخاوی دڵان حیلە و کۆرزنی کەحێلە
تاوێنی خەمان دەنگی مەرو بەرغەل و هاوێر

خۆزگەم بەوە ئەو فەسڵە بە چاوانی دەبینێ
زین نرخی لەلای خاوەنی بینایی‌یە نەك کوێر

ئەمش پارچە شیٔعریکی دی بە فارسی و کوردی سنەیی
کە لە سالی ٥٣ دا بۆ دوکتوریکی دلسۆزی خەڵکی سنە
کە دەردی فەقیری و هەژاری باش ئەناسی هونیوەتەوە ٠

بس سپاست کنم ای دکتر خوش قلب و غیور
کە مرا یاد تو بگشود در شادی و شور

از همان شب کە مرا دست قضا یاری کرد
جرعەیی چند روا داشت ز صهبای حضور

آنچنان عمق دلم مکن و مأوای تو شد
کە از این غمکدە بیرون نروی تا لب گور

دیدە کز لذت دیدار تو محروم چە باك
دیدەی معنیم از دیدنتان شد پر نور

کاش یکبار دگر بخت نگون یار شدی
با تو بنشینم و پیدا نشود کار ضرور

گفتەها رد و بدل کردە سخنها بە میان
بحث دربارۀ سرمای دی و مفلس و عور

مطلبی نیز بە کوردی بشنو جان دلم
تو شفا بخش مریضانی چە نزدیك وچە دور

دوکتور ئەم قاچ و قولەم دوور بێ لە رووت ئێشی فرس
ناشکێ زانی مەگەر بیخەمە ناو ئاگری سوور

خوا نەکا نەختێ بڕۆم تاوێ وەپاوە بوێسم
دێتە ئێش پاو پلم بۆم ئەگرین خوارو ژوور

سەرە رای قاچ و قولم ژانێ لە ناو شانما هەس
لێم حەرام بووگە خەوو خواردن و ئەنواعی سرور

فرە دەرمان و دەوام کردگە بێ سودە برا
رەنگە نوسرابێ کە بەم دەردەوە بمنێنە قبوور

سەیری خۆشتر لە مە من نیمە عەیالێکم هەس
هەموو ئازای لەشی بیمارە لە دیوی دەرو ژوور

لە روماتیزمەوە دەردێکی خەڵات کریاگە
کە لە هەر چوار پەلی گوێچکەی نییەی عەیب و قسور

سا لە ریێی هیممەت و ویژدانەوە فکرێ بکە بوم
بەشکەم ئەم دەردە لە لای تۆوە شفای بێ بە مروور

با سەرت زۆر نەیەشێنم لە کوروتن واز بێنم
نەک پەشیمان بی لە ناسین و ملاقاتی غەفور

زستانی ۱۳۵۲

## خەڵکی مەهاباد

کانگەی شەرەف و غیرەت و ویژدانە مهاباد
چاوگەی کەرەم و هیممەتی مەردانە مهاباد

جێی حورمەت و ڕێز گرتنی میوانە مهاباد
بوژێنەوەی روت و هەژارانە مهاباد

(( ئامادەیی خزمەت بە غەریبانە مهاباد ))
سابلاغی لە ڕێی پیاوەتی‌یا قەت نییە ترسی
کامی لە چەرە بیێت و لە ئاکاری بپرسی

وەك حاتەمە ئەو کاتە خەڵك کەوتە مەترسی
بۆ یارمەتی داماو تەحەل کردنی برسی

(( رازێنەرەوەی خوانە تەدر زانە مهاباد ))
کێ بەرهەم و ڕەنجی لە بەین بردووە لافاو ؟
کێ مالی هەموو ئاگری تێ بەربوو لەناکاو؟

هاواری بگاتە گەلی ئەم شارە بە پرتاو
بۆی دی لە جل و بەرگەوە تا پارە بە لێشاو
(( رزگاری دەکا فەوری لە تەنگانە مهاباد ))
سابلاغی سەدی دەی لە خەمی بون و نەبونە
باقی دی شەریکی خەمی داماو زەبونە

خەلکیکی نییەت پاکن و بیریان هەموو روونە
ئەم شارە لە بۆ کاری بەجێ بۆتە نموونە
تاریفی لە ناو خەڵکی وڵاتانە مهاباد
لێ بووردن و رەحم و بەزەیی لێرە کە باوە
میراتە لە پێشینەوە بەم خەڵکە براوە

ئازایەتیو غیرەت و هیممەت لە خوداوە
هەستێکە لە پاڵ میللەتی ئەم شارە نراوە
دل پاکی و بیباکی لە خوّی جوانە مهاباد
دڵیان پڕە سابلاغی لە ئیخلاس و ئیرادەت
روو خۆش و گەشن بۆ غەرەزن دوور لە حەسادەت

لایەنگری مزگەوت و ئەوینداری عیبادەت
دینداری و تاعەت چووەتە ئەوپەری عادەت
سەر چاوەیی خوانامی و ئیمانە مهاباد

لەم شارە برێک کار بە دەس خێوی مەعاش
بیستی لە سەدا خاوەنی سامان و قوماشن

داخم کە بەشی زۆرتری دەس کورت و لە پاشن
بۆ دەست و دڵ و خزمەتی خەڵکی هەموو باشن
ئەرکێکی گەلێ قورسی لە سەر شانە مهاباد

دڵسۆزی بەرەی لارە مل و بێ دەسەڵاتن
یاریدەدەری خەڵکی رەش و رووتی وڵاتن

ئەهلێکی بەشەر دۆست و بە بەخشین و خەڵاتن
لای گشتی لە مەیدانی کەرەم شەرمە هەڵاتن
(( چون مەرکەزی دەست گرتن و ئیحسانە مهاباد

کەمیان لە خەمی سەروەت و زۆر کردنی ماڵن
زۆربەی تەشەنی مەعریفەت و کەسبی کەماڵن

لاگیری حەقن دژ بە خورافات و بە تاڵن
لێزان و بە بیرن لە قەڵەم دا هەموو قاڵن
(( لانەی گەلی بیر رون و بزۆزانە مهاباد ))

شارێکی چ خۆش دیمەن و جوان و بە حەشیمەت
لاوانی چ خوێن شیرین و پیتۆڵ و بلیمەت

گەنجی هەموو گەنجینەیی هێژاو بە قیمەت
پیرانی پتەو بیرن و بۆ ئێمە غەنیمەت
(( زانستگەیی پسپۆر و ئەدیبانە مهاباد ))

من لێرە کەسێکم کە دەزانن هەموو شاوم
سی ساڵە لە ناو میللەتی ئەم شارە ژیاوم

پیرم بە رووالەت چلونۆ ساڵی تەواوم
پێم وایە لە سایەی سەری دۆستانەوە لاوم
(( خۆشی بە گەلی هاوڵ و دۆستانە مهاباد ))

خەزەڵوەری ١٣٥٣

## پەری گیان

ئەی تەختی هەئێت، تەختی سەزا دانە پەری گیان
وەی چاڵی چەنەت قوزبنی زیندانە پەری گیان

شمشێری برۆت پارە دەکا جەرگی ئەویندار
خنجێری موژەت قاتڵی لاوانە پەری گیان

پێکەوت شەوەیە ئاڵی دڵە رووەتی ئاڵەت
ئەم خاڵ و خەتەت قابیزی سەد گیانە پەری گیان

چاوت چەتەیە پیاو کوژە سێدارەیە بەژنت
رووت ڕێگرە کەزیەت پەتی خنکانە پەری گیان

بە ڕگێکە براوە بە قەدو قامەتی شۆخت
ئەم جەور و جەفاو خەڵکی بە کوشت دانە پەری گیان

لێوت وەکوو یاقووتە بزەت قووتە ددانت
مرواری یە یا خۆ دورە مەرجانە پەری گیان

چاو مەستی و تەردەستی و ئاشق کوژی و ناز
تەننازی و عەیاری لە تۆ جوانە پەری گیان

چاوم نی یە زۆر موستەحەقی خێر و زەکاتم
ماچێ بدە بەم کوێرە بە سەزمانە پەری گیان

هاوینی ١٣٥٤

ئەم پارچە شیعرەی لە زەمانیك دا هۆندوتەوە كە بۆ بژیـــوی رۆژانە محتەل بۆو تەنانەت رۆژی پێویستی بە دوو كیلـــــو نانی ویشكی ئەویش كیلۆی بە ١٧ قران بە نرخی شارەداری بۆو پێی نەكراوە . جا لە بارەی دەستەنگی خۆیڕا ئــاوای گــوتـــۆ:

لا لــوتــە لــە ئێمــە چــەرخــی گــەردون
پێـی حـەیفـە بـژیـن بـە بـەختیـــاری

دەستم بــە دوعـــایـە خـەڵكي بمـــرێ
تــا نـــانـــی بخـــۆیـن لـە تازیــە داری

بـەرگێكـــە بـە بـەژنـــی مـــن بـــڕاوە
قـــەرزاری و ســـەر كـــزی و هـــەژاری

پێـم نـاكــرێ رۆژی دوو كیلـــو نـــان
بـەو نـــرخـــی مـەبـاحـــی شـــارەداری

تـــف لـــەم بـەشـە لـــەم ژیـــانـــە حافـــز
ئـەو نـانـــە بكـــەی بـە ژەهـری مـــاری

بـــێ چـاوییـە هـۆی كـــزی و كـەساسیت
ســەر بـــاری خـەڵـــك بـی نـالـە بـاری

هـەروا بـــووە ژینـــی ئێمـــە مـانـــان
تـایبــەت لــە وڵاتـــی كـــوردەواری

شاعیر کە زیانی پڕ لە ژانە
فەرقی چییە پاییز و بەهاری

زۆر شێتی یە خۆزی گەر بخوازی
ئەم ساڵە کە بۆ پێراروپاری

کێ زیرو بە بیرو هەستیارە
بەختی رەشە تاڵە رۆژگاری

کێ خەلکی مەبەستە گەل پەرستە
زیندان و تەلانە جێی و قەراری

کێ زیترە دڵی هەژارە پارە دارە
جێی کۆشک و تەلارە بارە باری

ئەم خەڵکە تکایە لێم ببوورن
حەق نابێ لە هیچ کەسێ وەشاری

بۆ من نییە هەر بە تاقی تەنیا
رابوردویی تاڵ و کوڵەواری

بێ چاوی هەموو وڵاتی دیشوان
چاو بوایە دەچونە کەسب و کاری

زستانی ۱۳۴۱

له سەرەتای بەهاری ۱۳۵۳ ادا سێلاویك دەوروبەری بۆكانی گرت برێك ماڵ وێران بوون خەڵكی بۆكان پیاوەتێكی باشیان لە گەڵ ئەو لێ قەوماوانە كرد مەلا غفوریش بەو بۆنەیەوە ئەم پارچە شێعرەی هونیوەتەوە بە نێوی سپاس بۆ بۆكان لە بەر یارمەتی لێ قەوماوان

## سپاس بۆ بوكان

تێپەر بوو لە مریخ و زوحەل هیمەتی بۆكان
هەوری لە سەما خستە سەما غیرەتی بۆكان

ئەو هێرشە لافاوە كە هۆی چارە رەشی بوو
سەلماندی بە دونیا شەرەفی میللەتی بۆكان

چی بوو دژی ئەو ئاوە بێ ئامانە وەخۆ كەوت
هێزی بەزەیی رەحم و دڵ و یارمەتی بۆكان

كێ باوەشی گەرم و گوڕی گرتبۆوە بۆ خەڵك
تەنیا گەلی خاوەن كەرەم و نیعمەتی بۆكان

پیاو چاكی و دڵ پاكی و خزمەت بە هەزاران
بەرگێكە براوە بە قەدو قامەتی بۆكان

پێویستی بە تاریفی ئەم و ئەو نییە وەك خۆر
تیشكی لە هەموو جێ یە ئەدا شۆرەتی بۆكان

شانازی یە بۆ کوردی هەموو شوێن و وڵاتێک
چاوتێری و جوامێری و ئازایەتی بۆکان

نێو بانگی لە گشت ناوچەیەکا ویردی زمانە
دەنگی لە جیهان داوەتەوە پیاوەتی بۆکان

واتی مەگە بۆکانی لە چاو خەڵکی دی لۆردن
پێت وا نەبێ ئەندازی نییە سەروەتی بۆکان

مەردایەتی چی داوە بە سەر زۆر و کەمی ماڵ
هەر چاکە لە گەڵ خەڵکی بووە عادەتی بۆکان

## بەهاری کوردستان

بەهەشتە خاکی کوردستان و سەیرانی بەهارانی
نموونەی کەوسەر و ئاوی حەیاتە چەشمە سارانی

چیا وو دەشتی رەنگینە گوڵ و سوێسنە و ریاحینە
سەرا پا سەوزەلانی و شینە شیوەرد و شیارانی

حەیاتی جسمی بێجانە هەوایی باخ و باخاتی
نیشاتی رووحی ئینسانە فەزایی مەرغزارانی

شەفایی خاتری بێچارە قووتی عاشقی زارە
چریکەی بولبول و ئاوازی قومری سەر چنارانی

لە سەر دڵ ژەنگی ماتەم لادەبا روخساری گوڵزاری
بە چاو پێکەوتنێ سەد دڵ دەبیتە مات و حەیرانی

سەفا بەخشی دڵی عوشاقە بایی سوبحدەم وەختی
عەبیری بۆی گولان لە سەر لووتکەی نیزارانی

بەیانی دێ جریوەی مەل، خورەی بەفراوەکەی سەرکەل
لە گەڵ قاسپەی کەوە تێکەڵ لە دەم رزد و بەسارانی

کە تەشریفی شەریفی هات نەسیمی بای نەورۆزی
گوڵالان سەر وەدەر دێنن لە لێوی جۆبارانی

دەپۆشـێ  سەروی بـوستانـی کەوای ئەتڵەس لە بۆ جوانی
شکۆفـەی دەردەکـا لە ضویێ چڵووك و شـاخسـارانـی

تـەواوی دەشـت و دەر یەکسـەر دەبێتە ئەتڵەسـی ئەخزەر
بـە گـرمـەی هـەور و سۆزەی بـای شەماڵ و ریژنە بارانی

غـەزەل خوێنـی هەموو دەس پێدەکەن بـاڵداری سەرداری
زەوی پاکـی دەخەملـێ دیتەوە سـەر دۆخی جارانـی

کە مـانگـی بانەمـەر داهات چ خۆشە دیمەنـی کوێستان
سەراسەر خێوەت و رەشماڵ و خێڵــە جـێ هـەوارانـی

وەکـوو سەروی خەرامانـن کە پۆل پۆل دێنە مەڕ دۆشین
بە لـەنجـە و ناز و عیشوە شەنگە بێژی چاو خومارانـی

نەشـە بزوێنـە قاوو قیـژی کەسـك و سـوری خێڵانـی
قریوەی زاوو ماك و کار و کووری بـەرخ و کـارانـی

لـە لایەك داوەتـی کیژانە بەزم و رەزمـی لاوانـــە
لـە لایەك ئـەسـپ و رمبـازی جلیتـی شورە سوارانـی

لـە لایەك تیپـی زەحمەت کێشـی خاکی نیشتیمانی جوان
بە هێزی شان و هێزی بـازوو دەکێلـن دێمە کارانـی

لـە گـەڵ جـووتـی کەڵ وو گـا دێنـە مەزرایە بە دڵخوشی
لـە بـۆ کێڵانـو دەرهێنانـی مووچـە و جـێ بە یارانـی

خەریکی کەسب و کارن لاوەکانی نیشتمان پەروەر
بە ڕۆژ و شەو سەرەوتنیان نی یە تیبی هەزارانی

بە کورتی هەوڵی پێش کەوتن دەدەن کۆمەڵ بە خاس وعام
خەمم بۆ حافزی مسکین بەجێ ماوە لە یارانی

بەهاری ١٣٢٠

## کچی بۆکان

شەهێنی دڵ رفێنی خەم رەوێنی رووگەشی جوانی
حەسود کوێر بێ لە حاندت ئەی کچی نازداری بۆکانی

لە بەر بەژنی بڵیند و ناسکت هەتیانە سەر داخەن
چنار و عەر عەر و شمشاد و کاج و سەروی بوستانی

لە شوخ و شەنگی یا وێنەم نەدیوی شەرتە نازانم
لە حۆری هەڵبراوی یا لە تیرە و هۆزی پەریانی

لە وردی خاڵی سەر کوڵمت ئەمە ستو واقی وڕ ماوە
لە تەسویری برۆی تۆ عاجز و بێچارەیە مانی

دەمت عیسا سفەت مایەی ژیانە، لە مپەری گیانە
لەشی مردوو هەناسەی تۆ.وەبەر دینێتەوە گیانی

خدر بۆ هێندە عەبدال بوو بە دوی سەر چاوەکەی ژینا
تنوکێکە لە نێو شیوی مەمانت. ئاوی حەیوانی

لە چاغی پیری یا دیارە وەعا بۆت بوومە بەتیارە
لە وانەم مل بدەم بەو کارە کردی شێخی سەنعانی

ئەگەر چی پیرو زۆرهانم ـ لە گەڵ تۆ ئافەتی گیانم
دەبەستم عەهدو پەیمانم. هەتا هەم بۆت دەکەم شوانی

لە سەیری باخی میراواو تەماشای حەوزە گەورەم چی
زنەی بەر گەردن و نێو باخی سینەت خۆشە سەیرانی

لە بیرتە ؟ زۆر نەخۆش بوم هاتی بۆ پرسینی ئەحواڵم
کووتم پێت خۆشە نەمرم با سەرت باوێمە سەر رانی

بزوت هێزی هیواو هەستم کە دەستت نایە نێو دەستم
کووتم هەر تۆ لە جێت خستم کەچی وا ئێستە لوقمانی

گەشم یا وەك بەهێی زەردم لە کۆشکم یا لە بن بەردەم
بە دەس تۆیە شفاو دەردم کە بۆ من ژینی هەم ژانی

بە روو خوشی کە بەدوێنی حەیاتی نوێم لە بۆ دێنی
بەڵام خۆت تورە بنوێنی مەرگ دێنی بە هاسانی

مەرێزە پێم رق و قینت بەدڵ هاتوومە سەر دینت
قەبووڵمە کێش و ئایینت مەسیحی یا موسوڵمانی

وەئەستۆ مەگرە ئۆباڵم بە دووتا وێڵ و عەبداڵم
لە بۆتەی عیشق دا قاڵم دڵم بۆت بۆتە بریانی

دڵی پێکام پەکەم تیرت دەس و پێم کەوتە زنجیرت
لە حاڵ و باڵی یەخسیرت بپرسە سەختە زیندانی

ئەوینت بوو بە ناپاڵم بڵێسە و تینی نا پاڵم
بە تیری تۆ شکا باڵم پەرو پۆم چی بوو پەروانی

نه تەنیا من لە جوانی تو دوواوم ئەی کەژی شەوبۆ
هەمو کەس بۆت دەمدا لە ستۆ کە سەرتۆپی موکوریانی

لە ناوچەی موکری یا تاقی نەزمرگەی پۆلی عوششاقی
لە رەنگی کوڵمی تۆ ساقی دەکا سەر خۆش موریدانی

لە وەسفی ئەو خەت و خاڵە قەڵەم کوڵە زمان لاڵە
دەمم بەو دوو لیمو کاڵە نەگا دەمرم لە سوێیانی

بە دیمەن گەر چی منداڵی لە ئاشق کوشتنا زاڵی
نەوەی کاوەی دلێری یا بەرەی سامی نەریمانی

سەرم گۆیە لە مەیدانت دڵم دیلە لە زیندانت
لەش و گیانم بە قوربانت فریشتە خوو خوای جوانی

دەکێشم نازی پێڵاوت هەمو ژینم لە پێناوت
دەنیێم فیدای چاوت دەکەم تۆ مانگی ئاسمانی

ئەگەر چی خاوەنی ناوم لە نێو ئەم خەڵکە ناسراوم
بەڵام من قەترەیەك ئاوم لە بەر پێی یاری بۆکانی

ئەویندارێکی دڵپاکم لە سوێی ئەو یارە خەمناکم
لە گەردونیش نی یە باکم بگا دەستم بە دامانی

هاوینی ١٣٥٨

ئەمەش پێنج خشتەکی یەك بەکوردی و فارسی لە سالی ١٣٥٩ دا هۆنیویەتەوە ·

## شوخی ئاوایی

لە کوێی ئەی شۆخی ئاوایی دڵم تۆقی بە تەنیایی
رەوا تاکەی دەبینی پێم مەراق و مەینەتی جیایی

لەوانەم تەرکی دونیا کەم وەکی دیوانە ئاسایی
(( بەکوە دشت روی آرم بجای عقل شیدایی ))
(( گزینم چون زند این عشق پیری سر بە رسوائی ))

لە کوێی ئەی یاری شیرینم دەوای دەردی دڵی زار
منیش وەك قەیسی پەتیارە خەریکم شێت بم و فیدار

لە دوری لەیلی بێ مەیلم پەنا بەرمە کەژو کۆسار
بیا ای شوخ شیرین کار مرا دریاب مجنون وار
غبارآلودە و ژولیدە مو چون غول صحرایی

دە تو خوا پرچی پر چینم لە مل هاڵێنە چەشنی مار
لە داری بەژنی بەرزم دە هەتا زوتر ببم رزگار
لە ژینی پڕ لە ژان و عیشقی بێ ئاکام و جەوری یار

(( ترحم کن بە اشك جانگداز و آه آتشبار ))
(( ز آهم بی گمان سوزد رواق چرخ مینایی ))

به پێنوسی قەزا دەستی قەدەر بۆ ئێمە وای نوشــی
بەشی تۆ تورەیی و عاشــق کوژی بێ من زمان لوســـی
کەوا بو حــازرم بۆ خزمەتی پێـڵاوو پــا بوســـی

قــدم بر دیدگانم نه پــس از نیــم قرن مأیوســـی
بەچشمانم کــه شایــد باز گــردد نــور بینایـــی

له تۆ زیاتر پەنــای دیکەم نیەیە بۆ کێ بەرم هانــا
له سەر خاڵ وخەتی تۆ ئیعتیبارو ئابروم دانـــا

دڵم مێشی گوڵی روتە سەرم گۆیە لــە مــە یــدانـــا
سرت گردم ســراغ عاشــق زارت بیـــا جــانـــا
کەجان برلب شد از ســودایــت ای اَلگوی زیبــایـــی

بنازم بەو قەدو باڵایە ئەی شۆخــی له خۆرازی
له ناز و نیعمەتی جوانی بەشت زۆرە گــەلــێ ســـازی

هەڵــۆ له برمو دەخا چــاوت غەنیمی تاوس و بـــازی

هــلال ابـــرو تو شمــع جمــع مــە رویـان ممتـــازی
جمالــت آفتاب اســت ار نقــاب ازچهره بگشـایـــی

لــە جــوانی و پاکــی یا زیاتر له خاتــوزینــی بۆتانــی
خــەزاڵــی لاسە شۆر کەمتــر له تۆ بو شۆرەتــی جوانی

لـه دەست چوو عیززەتی نەفسم لە ڕێگەی وەسڵی دڵدارا
بە بەدناوی دەبەن ناوم لە کۆڕی یارو ئەغیارا

لـه سەر تۆ بومە گەبجاری کەس و ناکەس لە دێ و شارا

زمان آخر نخواهد شد کە یکشب کلبۀ ما را
بە یمن مقدم و مهتاب رخسارت بیارایی

لە پێناوی ئەوینم ناوە زین و دین و دونیاکەم
لە بەر لۆمە و توانجی دۆست و دوژمن خڵا دەکوێ ڕاکەم

دەمراوم لات ئەگەر رون بێ لە هیچ کەس شورمیی ناکەم
چنان مست می عشقم زطعن دهر بیباکم
شوم خاك رهت گر قلب ناشادم بیاسایی

بە دوتا وێڵ و عەبداڵم منی داماو و بێچارە
لە تاوت وەك بەرا مەردو شەپۆڕو شیوەتم کارە

بە جوانیت سوێند دەدەم روحێ بکە بەم پیری پەتیارە

مگیر از من کنارە سعی کن جانا کە یکبارە
تشخص را کنار اندازی و با من کنار ایی

کە نیشکی کافرۆش ناگاتە چاوت مەستی چاوانی
زولە یخا تەلعەت و لەیلی وەش و شیرین زەنەخدانی

سزد جانا زنم گر لاف وامق چون تو عذرایی

کراسێکە لە بەر تۆدایە شۆخ و شەنگی جوانچاکی
ئەوی جوانان لە لایانە بە پەژنی تۆ برا پاکی

لە تیرەو هۆزەکانی کوردەواریدا ئەتۆ تاکی

فرشتە خلقتی حوری سرشتی گرچە از خاکی
صنوبر قامت و سنبل عذار و سرو بالایی

ئەو پارچە شێعرەی بە یادی کچە کوردێکی سنە هونیوەتەوە کە لە عالەمی خەودا لەگەڵی بۆتە ئاشنا . ئاخری بەهاری ١٣٥٨

## کچـــــی سنــــــە

دل فــرە کەستەنگـو کەیلـم بۆ کەنیشکێکــی سنـە
تیری برژانگی لە سینـم داگـە گشتــی کون کونــــە

خــاڵ گەلی خــوا کردو ورد ورد ها وەبان گۆنایــەوە
حاشیـەی زولفیـش لە دەوری جێی متاڵا کــردنــــە

نوکــی پەیکــانــی موژەی ئــازایــە بۆ پێکانــــی دڵ
پاشە کەوتــی مــادە پیشــەی دیـارە عاشــق کوشتنـە

دوایــی نایە وەصف و تاریفــی لە جوانــی و پاکی یـا
شــۆخ و باڵا بــەرزو تــەرزو پەلکــە شــۆر و پرچنــە

مانــی گێــج و حۆل ئەکـا قەوســی برۆو نەخشی تەوێڵ
عــەقڵــی ئەفـلاتون لە چاڵــە قوتــی گەردنیا وونــــە

لیـوی لەعلــە دیانگەلــی وێنــەی دورو مـرواری یـــــە
عەینــی نوقرەی گۆی جەناکەی سینە پــان و گۆشتنــــە

چــاو گەلی دو زەنگی تیــا هەر تیر ئەخەن بۆ پیرو لا و
دوو بــرۆی پەیوەستــی شمشێــری قەڵاچــۆ کــردنـــــە

ئاشنا بوگم له تەکتا من لە شیرینی خەوا
تو دڵت بردم بە گفتی خۆش و خرنگەی بازنە

دەنگی تۆ وەك کارەبا مجورکی هاوردە لە شەم
ئەتوت ئازام گشتی مارانگازە دەرزی ئاژنە

عەشقی تۆ داگیە لە کەللم بێقەرامی کردگە
یادی تۆ بۆ من لەباتی خواردنە هەم خەوتنە

ناومە زێر پای خەیاڵت شۆرەت و ناوو نیشان
یادی پیرۆزت لە دڵما تا دەمی کۆچ کردنە

گەرچی ئێژن ( عشق پیری سر بە رسوایی زند )
چارە چەس؟ جەرگم بە خەنجێری فیراقت جن جنە

وا ئیتر خۆم خستە دەرگات و شفاو لاڵم فرەس
ئارەزوو ئاواتی وەسڵت تاکو رۆژی مردنە

بیکە خێر جوانیت و ساقەی سەر لە قاپیم دەرمەکە
ناگەڕگیە . خوا ، کەمن پیشەی گەدا دەرکردنە

گەردن و روو سینە دەرخە بێژە حافز بۆ بەرەو
دیارە ئیدەی تۆ گوڵە تاوێ لە باخم گوڵ چنە

تەختی سینەی جامی جەم روومەت گوڵی باغی ئیرەم
ئاوی سافی زەمزەمی چی ها لە ژێر سای گەردنە

مەمکی وی جفتی شەمامەس یا دووگۆی مەرجانییە
روی وەکو مانگی شەوی چاردە شەفاف و رۆشنە

ئاوی سەر چەشمەی حەیاتە ئارەقی سینە و مەمی
گەردی پێڵاوی کلی سینایە بۆ چاو رشتنە

ئافەتە بۆ گیانی ناکەس راحەتی رووحی کەسە
نۆشی هەس بو ئاشنا گەل نێشی بۆ گیان دوژمنە

ئەو سەرا پا جوانییە نەختاڵی عەیبی تیا نییە
تا خوا حەزکا مەتین و با وقارو شەرمنە

خۆرە تاوی روی بە چەشنی کابە قیبلەی عالەمە
شەورەشی زولفی قەنارەی دڵ تەنافی گەردنە

شاد و شیرین گفت ولفتە دۆسی پاکی و راسی یە
لای سەرەی ناپاك و بەد رو گرژە تورە و تۆسنە

چەند بە ئاواتم بە قسمەت بێ بچم بۆ خزمەتی
بێژم ئەی ئاهوی خوتەن ئەی سور گوڵی شاری سنە

پیرو نابینام و ریش چەرمو لە دورە و هاتگم
عەرزو حاڵم هەس ئەشێ گوێ بەیتە ئەم عەرزی منە

له ۱۹/ ۱۰/ ۵۷ که یه‌کەمین خۆپیشاندانی دژی دەسەڵاتداری پاشایەتی له ئێران دەستی پێکرد مەلاغفور بانگەوازی له گەلی کورد کرد تا وەکو لەو خەباتە رەوایەدا بەژدار و پشتیوانی گەلی یەك گرتوی ئێران بن چونکی به بروای شاعیر سەرکەوتن بەسەر دیوەزمەی ئیستیبداد بۆ یەکیەتی هەموچین و توێژەکانی قەت جێ بە جێ نابێ

## سلاوێکی بەرمانا

سڵاو بۆ خاکی کوردوستان وخەڵکی زیت و وشیاری
سڵاو بۆ کوردەواری بۆ تەواوی ئەهلی دێ و شاری

سڵاو بۆ نیشتیمانی جوان و شاخی بەرزو بەفرینی
سڵاو بۆ بەندەنی بزوێن و کانی ساف و سازگاری

سڵاو بۆ دیمەنی تەرزی چیای ز نوێر و سەرسەوزی
سڵاو بۆ شیو ودۆڵ و رستە تاوڵ و چینی مەرداری

سڵاو بۆ تەڵبەزەی ئاوی تەلان و رزد و هەلدێری
لە بنیا زیخ و چەو دەنوێنێ وەك یاقوت و مرواری

سڵاو بۆ گشت دەر و دەشتی بەهەشتە دیمەن وگەشتی
سڵاو بۆ خورخوری روبار و مێرگ و چیمەن وداری

سڵاو بۆ کۆمەڵانی خەڵکی زەحمەتکێش و ئارەق رێژ
سڵاوی تایبەتی بۆ چینی جوتیار و کرێکاری

سڵاو بۆ ئەو برا وەرزێرە وا جەرگی زەوی دەدرێ
هەتا ژینی مە دابین کا لە داهاتی زەویو زاری

سڵاو بۆ ئەو برا درۆینەوانەی تاکو شەو دادێ
لە گەڵ کەرخ و مەلۆ و داس و مەڵەغانە سەر وکاری

سڵاو بۆ ئەو کەسەی شەتڵانی ئارەق بوو لە مەزرایە
دەم و لێو ویشك و تاو بردو ، پەریوە رەنگی روخساری

سڵاو بۆ ئەو کەسەی هێند ماندووە و کوێرەوەری زۆرە
شەوێ نانوێ لە تاوی شان و پیل و ئێش و ئازاری

سڵاو بۆ ئەو کەسەی کاری بزارە و دەسکەنە و بن کۆڵ
گەلی ماقوڵترە دەست و پەلی تەڵشیوو زاماری

لە دەستی ناسك و نەرم و سپی بێکارە و تەنبەڵ
لە سەر خەڵکی بەرێ دەچن و دەخۆن نانی منەت باری

سڵاو بۆ ئەو کەسەی دەژێنێ منداڵی بە فاعلایی
بە هێزی لەش بژیو پەیدا دەکا بێ شەرمە بێکاری

سڵاو بۆ ئەو کەسانەش بێ دەبرژێن تا دەبرژێنن
هەمو دەم نانی گوڵپەرشە و بەهار و گەنمە سەرداری

سڵاو بۆ ئەو کەسەی ئیدە و مەرامی خزمەتی خەڵکە
هەمیشە یارمەتی داماوو لێ تەوماوە ئاشکاری

سڵاو بۆ ئەو کەسەی ژینی بەخت کا بۆ گەل و هۆزی
هەتا کو دوا هەناسەی بەر نەدا رێبازی رزگاری

سڵاو بۆ لاوی رۆشن بیرو گەنجانی بە بیر و زیر
سڵاو بۆ میللەت و رۆڵەی ئەمەك ناس و وەفاداری

سڵاو بۆ نووسەران و هۆنەری دڵسۆز و تێکۆشەر
سڵاو بۆ ڕێبەرانی ڕاستەقینە و تیپی خوێندکاری

سڵاو بۆ ئیتحاد یەکیەتی گشت کۆمەڵانی خەڵک
لە مامۆستا و قوتابی تاکو کاسبکار و بازاری

سڵاو بۆ پێشەوای دینی کە ڕێ نیشاندەری خەڵکە
بە مەرجێ کردەوەی یەك بێ لە گەڵ شیرینی گوفتاری

سڵاو بۆ ئەو کەسەی ڕاست و نیەت پاکە لە گەڵ خەڵکی
بە موو تێی دانیە پێچ و پەنا لێی ناوەشێ خواری

سڵاو بۆ ئەو کەسەی جێی باوەر و متمانەیە بۆ گەل
بە سودی میللەتی خۆیو و گەلانە تەرزی ئەفکاری

سڵاوم هەرچی بوو پێشکەش بە ئێوەی خۆشەویستم کرد
لە مەر خۆمانەوە چەن مەتڵە بێژم دێتە سەر زاری

تکا کارم لە خەڵکی شار و لادێ کانی کوردوستان
لە گوێ مەگرن قسەی کەس تا نەزانن چۆنە ئەتواری

کەسێ ئیمرو قسەی خۆشە ئەگەر عەیبی بوو مەیپۆشە
دەبێ روون بێتەوە دوێنێ چلۆن بوو ژین و رەفتاری

گەلێ هەن وەك برایەك دێن و دەتدوێنن بە دڵسۆزی
بەڵام مەعلووم دەبێ سۆزی کە پێوەی داوی وەك ماری

گەلێ هەن ئێمە دەدوێنن لە قەڵا گێڕە شێوێنن
جودایی و دوو دڵی و ناکۆکیان هێناوە بە دیاری

گەلێکیش هەن کوڕی ڕۆژن زەمانە مل کەچی کردوون
دەگۆڕن ڕەنگ و ڕویان دێنە ناو کۆمەڵ بە ناچاری

لە سەرمان یەکیەتی فەرزە دەبێ تێکرا بەجێ بێنین
دەبێ پشت و پەنای یەك بین و بگرین دەستی هاوکاری

برای هاوبەشتی یەکتر بین هەتا بێگانە نەتوانێ
بخاتە نێو سەفی ئێمە کەلێنی قین و لاساری

ئەگەر سەرتان لە هۆنراوەی غەفوور ئێشاوە بم بوورن
بە قوربانی تەواوی خەڵکە خۆیو بەیت و ئەشعاری

قسەم هێشتا گەلێ مابوو مەبەستم زۆر لە دڵ دابوو
بەڵام چ بکەم قەڵەم چیدی نەکردم کۆمەك و یاری

# بهار

مژده باد ای ساکنان خاک پاک این دیار
زانکه برفرش چمن خرگاه زد فصل بهار

ازغریو کوس رعد و نعرهٔ باد شمال
کاخ بهمن سر فرودآرد به پای کوهسار

روضهٔ خُلد برین هرسو نمایان میشود
روی صحرا بو دهد ازلاله چون مشك تتار

چون دم عیسی نبات مرده را احیا کند
باد نوروزی به امر خالق پروردگار

گوش دل را می نوازد قهقههٔ کبك دری
می زداید غم ، نوای قمری و صوت هُزار

عندلیبان چمن با سایر مرغان باغ
نغمهٔ شادی همی خوانند بر هر شاخسار

نشئه بخش عاشقان یعنی نسیم صُبحدم
آورد همراه خود بوی عبیر از زلف یار

درچنین فصلی چه خوش باشد به کام دل دمی
با گروهی لاله رویان وبتان گلعذار

مجلس ستانه برپا کرده درصحن چمن
بگذرانی درسرور وشادی وبوس وکنار

با وجود این همه حزن و پریشانی که داشت
نظم شد.این چند بیت.ازحافظ محنت گسار

## چیم گەرەکە

گوڵی بێ بۆن و بەرام دیمەنی بێ نرخە لە لام
من گوڵی ئاڵی عەتردار و بە بۆنم گەرەکە

من قسەی خۆش و بزەی لێوە دەبزوێنێ نەشەم
کەی مرو مۆچ و خولْق ناحەزو مۆنم گەرەکە؟

دڵ بە سەد هاوڕێی بێ مێشک و نەزان ناسرەوێ
هاو دەمێکی وەکو تۆماس ئەدیسۆنم گەرەکە

نانی ویشکی قەوەتی مشکە هەتا بۆم دەلوێ
پشتە مەغزەی قەڵەموو چێشتی بە رۆنم گەرەکە

قەت بەکیلۆ و سی‌یە تێر نابێ زگی خۆم و منداڵ
دەست بدا میوە بە خەڵوار و بە تۆنم گەرەکە

بۆ تەسەل کردنی خۆم و گەلی داماو هەژار
سەروەتی راکفیلێر و لۆرد کەریتۆنم گەرەکە

کۆت و شاڵواری ئوروپایی ئیتر ناکەمە بەر
رانکو چۆغەی سەوز و دەستکری خۆنم گەرەکە

لە تەماشای شەق و تۆپ بازی ئولەمپیک وەرەزم
حۆقە حۆقی کەڵ و گامێش و شەقۆنم گەرەکە

بۆ ئەوەی رازی دەروونم بە خەڵك راگەیەنم
دوو بڵیند گۆی مەزن و مایکرفونم گەرەکە

من لە رۆژنامەوە ئەخباری سەحیح نایەتە گوێم
رادیۆش لوتفی نییە – تەلفیز پیۆنم گەرەکە

خواردنم کەم بووە چەن حەفتەیە گیراوە مەدەم
پیپسی سارد و سوێن ئاپ و سیفۆنم گەرەکە

حافزم نیمە بە ماکینە وەشۆرم جل و بەرگ
رەقە سابونی مەراغە و ئەسپونم گەرەکە

بەهاری ١٣٥٩

سیفۆن = نۆشابەیەکە وەك پیپسی بە زمانی کوردی عێراق
شەقۆن = بە زمانی مهابادی شاخ تێ هەڵدانی مانگا

---

لە خوێندنەوەی ئەسپۆن بۆ وەزنی شیعر بە سەر هەمزە و
زەنەی سینەکە بخوێندریتە وە ٠

# گوڵەکەم

گوڵەکەم بۆ گوڵی روت عاجز و ماتم بە غەوس
تا کو ژێر گڵ دەخریێم هەر بە تەماتم بە غەوس

وەرە ئاواتی دڵم شەوق و روناکی مەنزڵم
من کە تۆم لا نەبێ بێ سەبر و سەباتم بە غەوس

تەڕ ببێ لێوی بە بارم لە زنەی شێوی مەمان
وا دەزانم کە لە سەر ئاوی حەیاتم بە غەوس

روم بدەیتێ لە جیهان بەختەوەرم تاجی سەرم
دەست دریێژ و مەزن و میری وڵاتم بە غەوس

بیێت و لێم تورە بێ گریانە بەشم چارە رەشم
هەر هەمان چاو لە دەس و بێ دەسەڵاتم بە غەوس

زۆر نەخوش و کە لەلام ئەو دەمە نادیاری لە لام
باوی شادی و نەشەمە کاتێ لە لاتم بە غەوس

رەنگێ ترین رۆژی ژیانی منە دور کەوتنی تۆ
خوشبەخت تر بەشەرم تا لە پەناتم بە غەوس

پێ لە ماڵم مەبرە شەرتە بە شانازی یەوە
حازری خزمەتی ئەو کەوشە لە پاتم بە غەوس

گوڵەکەم حۆری لەقا خونچە گوڵی باغی سەفا
بولبولی شێت و ئەویندار لەقاتم بەغەوس

بەمە زیندانی جەفا بمگرە ئامێزی وەفا
بەسەر و ماڵەوە قوربانی وەفاتم بەغەوس

ڕۆژی من رەش مەکە چەشنی وەلی دیوانە دەخیل
پڕ لە ناکامی دەبێ گشت دەم و کاتم بەغەوس

بێمرادانە مەگەر دەست دەمە کەشکۆڵ و عەسا
وێڵ و شەیدا بم هەتا ماوە حەیاتم بەغەوس

ئەمە ئاواتمە هەرگیز لە پەنای تۆ نەبزوم
تاکو دوایی تەمەن و وەخت و سەعاتم بەغەوس

ئاشە کوتێك و حەسیر و خەوی سەر باوەشی یار
وا دەزانم کە لە ناو کۆشك و قەڵاتم بەغەوس

شۆخی شیرین وەرە لام تاوێ نەخۆشی دەسی تۆم
دەست لە دەستم دەبڵێ هەستە شیفاتم بەغەوس

ئاهو ناڵین بەسە لوقمانی ویساڵت لە کنە
دەردی دڵداریە خستوتی دەواتم بەغەوس

ئێش و ئازاری لەشم دەرکە بە ماچێکی دەست
شەکەتی کولمی گەش و لێوی نەباتم بەغەوس

بەزەیت بۆ بەمنی چارەڕەش و پیر و کەساس
حافزم موستەحەقی خێر و زەکاتم بەغەوس

زستانی ١٣٥٨

## زنجیرە

ئەو بەژنە لە بارەت کە دەڵێی خەڵفی چنارە
بەو پرچە درێژانەوە لێم بۆتە قەنارە

زنجیرەی سینتۆیە مەگەر پەلکەیی شۆرت
بۆ گرتن و خنکانی گەلی کوردی هەزارە

بۆ کوشتنی تێکرایی چ چالاکە مژۆڵنت
لەم خەڵکە کە چەوساوە لە ژێر باری پەژارە

وەک بەندی قزڵ قەلعە دەچێ چاڵی چەنەی تۆ
هەر چی چو بەشی جەزرەبەیە قەمچی یە دارە

ئەگریجە کە فەرمانبەری ساواکی بڕۆتە
دیلی دەمی ئەو رو رەشە زیاتر لە هەزارە

کێت کوشتووە وا شاهیدی خوێن خۆرییە لێوت
نینۆکی دەمی شت کە بە خوێن دا چووە دیارە

توزێ بەزەییت نایە بەوانەی کە لە تاوت
وێڵن لە دەر و دەشت و جێیان کێو و نزارە

"١٣٥٤"

## شیعرێکی بۆ نیشان

نه‌فام و هه‌رزه‌ ئێژن پیاو به‌ پاره‌ زێر و ماقوڵه‌
به‌ڵام پیاوی به‌ بیر و ژیر ئه‌وی پێی هیچ نه‌بێ پوڵه

له لای به‌عزێ ئه‌وی کۆشکی هه‌بو فۆرتی له بن پێ بوو
په‌سندی خه‌ڵکه زانایه ته‌سه‌ی جێ گیر و مه‌قبوڵه

ئه‌وی لای گه‌ل به قه‌در و قیمه‌ته‌ با پێت بڵێم کێیه
که‌سێکه خۆی وه‌لا ناوه به‌ کاری خه‌ڵکی مه‌شغوڵه

نه‌جابه‌ت کرده‌وه‌ی جوانه رووالّه‌ت بۆ فریو دانه
ئه‌گه‌ر بۆ سودی شه‌خسی بێ سه‌ولدیش هه‌ر وه‌کو پوڵه

ده‌بینی گه‌ر ته‌ماشا که‌ی به دیققه‌ت سه‌یری دونیا که‌ی
له بۆ پڕ کردنی گیرفان و ورگه ئه‌م جم و جوڵه

به‌ بیری بێنێ دارێک بی چه‌مێنی ره‌نگه بیشکێنی
به‌لام هه‌ر چونی مه‌یلت لێ بو وای دێنی هه‌تا شوڵه

مولاقاتی که‌سێکم کۆنترین ئاواته هه‌ی هاته
ئه‌من لێره له کوردوستان ده‌ژیم و ئه‌و له دزفوله

مه‌له‌ی گۆمی سیاسه‌ت حه‌سته‌مه‌ حافز مه‌چۆ نێوی
گه‌لێ پسپۆری تیا خنکاوه بێ ئامانه زۆر قوڵه

پائیزی ۱۳۵۸

## ناحەز و جوان

تا بژیم تێت دەبڕم خاوەنی جوانی و دەسەڵات
چاوی ئاوات و هیوام ئەی گوڵی سەرتۆپی وڵات

دا دەمرکێ کوڵی دڵ تاوێکی رێت خەم چدەبێ
بە سەری نوکی زمانم لە بنی پەنجەیی پات

رۆژی هەڵکەوتە دەجا بۆ گوڵەکەم تێت راکەم
لە ترۆ مبیلی فیداکاری بەرەو کۆری خەبات

لێت دەبەم جارێ بە بێدەنگی نەچی بیکەیە قاو
نێوی هاوکاری لە گەڵ شۆڕشەکەی

یاری شیرین دەوەرە تا زووە تا لێت نەچووە
تەمەنی جوانی بژین پێکەوە تا کەی بە تەمات

گیانەکەم خۆ تۆ هەزار جار پترت داوە بە من
قەولی بۆ کردەوە هەر وشکە تریتم بە هیوات

کەنگێ بۆم دا دەکەنی خۆمی بە سەر دا کێشم
کەوشەکەت ماچ کەم و سەر دانێمە بەر پێتکرومات

لێت نەچێ رەنگە لە بەر تەنگی ئەشقێ بۆت تەرکەم
دەستە نەرم و شلەکەت بازنە ئازاری نەدات

توندو تیژی بەسە بۆم تیل کە دمبا لـێی را دەم
بە سێڵ گەسکی دەم ئەو تۆزە لە سەر شانی کەوات

تۆ لە سەر ئەو رتە بێ تێك دەچە تێنین لـە پـڕا
من لە پێت درکی مژۆڵ تۆ لە دڵـم تیری نیگـات

هەر نەبێ تاقە بە کیکم دەیە با خۆم نەکـوژم
لەم هەمو دەسرە کە پێی دەسری دەم و لێوی نەبات

بێڵـە خاوی کـەمەوە رەق بـووە سندوقـی سەرت
باری لیـوم بە تکەی ئارەقـەکەی سەر گـۆنـات

پـاش و پێش هەر یەکە بۆ من کە مەبەستـم چونـە
زەردە لیمـو چووە ناو دەستەوە یا پرچـی سیـات

هەر لە لای تۆیە ئەوەی من دەمەوێ تۆی کێشـم
خۆڵی بەر پێتە لە چـاوم کرێ روناکـی دەکـات

حەز دەکەی جارێ بژیم بۆم وەرە پێش با تۆی نیـم
دەم لە نیوانی مەم و سینە وەخۆم ئـاوی حەیـات

نایەڵـم بێشی وەرە پێشـی دەبـا بۆت تێخـم
ئەم دوو ئەنگوستیلە ئاڵتونە ٭ لە قامکت بە خەڵات

دەوەرە گیان و قەومت تاوێ ئەوەم بگـرە بـە وەت
نەزمـی دەستم بە سەری پەنجـە نەخۆشـم کەلەلات

من که خۆم ناومته پێناوت ئەتۆش بۆم فـەش کـە
تۆڵی راستت بخەمە باسکم و دەرچین لە وڵات

با بکەم تۆبە لە سەر دەست و ئیتر دای هێڵم
ریشی بۆزم ببمە سالکی ببەر کۆشك و سەرات

تا کوتم کوانی ؟ بڵێ هانێ دڵم مەشکێنە
حافزم موستەحەقم چاو لە دەسی تۆم هەمو کات

جوانی تۆی دا لە محەك ناحەزی من بۆم دەرکەوت
ئەوی جوانان هەیانە بە تەنیا هەیە لات

( ئەم شیعرانەی سالی ۱۳۵۰ هۆنیومەتەوە و سالی ۱۳۵۹
ئەم دو شیعرانەی خوارێ لێ زیاد کردووە ۰ )

گوڵە کەم بۆیە نەشمەت سازە دەڵێن چاکت دا
ئیمتیحانی شەشی ناوەندی بۆی مامۆستات

خۆت کەسێ شل کە سەرت داخە دەبا پێتەوە نیم
دوو زەرو کوڵمی گەش و چاڵی چەنەت زیبکە نەکات

---

له فارسیش دا ئەسەدی توسی لەم شیوە شیعرانەی
بە شیوەی ناحەز و جوانی هەیە ۰